حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
ڕێڤەبەریا گشتی یا پروگرام و چاپەمەنییا

# بابەتێن کۆمەلأیەتی

## بۆ پۆلا حەفتێ بنەڕەت

دانان

جوگرافی

د. جەزا توفیق طالب    بەیان حسین    احمد علی احمد

مێژوو

رافدة عبدالله عبدالصمد    عطا عبدالرحمن محی الدین
شوان عثمان    ئاراس فریق زینل
صلاح کانەبی اسماعیل

هاونیشتیمانبوون

سەرکو احمد محمود    کامل نوري علي

وەرگێران

لیژنەیەکێ ژرێڤەبەریا گشتی‌یا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ ژ زارێ کرمانجیا خوارێ کریە کرمانجیا ژۆرێ

چاپا حەفتێ    ٢٧١٥ کوردی    ٢٠١٥ زایینی    ١٤٣٦ مشەختی

# پشکا ئێکێ

## دەرازینکەك بۆ زانستێ جوگرافیێ

پێناسا جوگرافی: زێدەتر ژ هزاران سالایە ئەردی کارتێکرنا ل مرۆڤی کری و مرۆڤی ژی کارتێکرنا کریە سەر ئەردی، هەر ل دەسپێکا ژیانێ مرۆڤی هزر یا ل دیاردێن سروشتی کری وەکی لەهی و پیڤەلەرز و گرکان... هتد و ڤان دیاردا کارتێکرن و مەترسی یا ئێخستیە سەر ژیانێ، و مرۆڤی د وی دەمی دا ب رەنگەکێ ئاشوپی (خەیالی) دیاردێن سروشتی شلۆڤەتکرن، دەمێ هزر و بیر بەرفرەه بووین لێکدانێن دروستتر بۆ وان دیاردا دانان و ئەڤەژی دەسپێکا دەرکەفتنا زانستان بوو، و زانستێ جوگرافی ژی ئێك ژ وان زانستان بوو، و بەردەوام بەرەف پێشڤە چوویە هەتا ئەڤرۆ، ل دویڤ ڤێ چەندێ ئەم دشێین پێناسا جوگرافیێ ب ڤی رەنگی بکەین:

جوگرافی ئەو زانستە ئەوێ ل دیاردێن سروشتی و مرۆڤێن سەر روویێ ئەردی ژ لایێ وەکهەڤی و جیاوازی و کارتێکرنا ئەڤان دیاردا لسەر هەڤدو ڤەدکۆلیت.

## تايێن جوگرافيێ:

**جوگرافی ب گشتی دبیته دوو تایێن سەرەکی:**

**ئێك: جوگرافیا سروشتی:**

ڤەکولینێ لسەر هەموو دیاردێن سروشتیێن سەرئەردی دکەت، وەکی بلندی و نزمی، ئاڤ و هەوا، زیندەوەران.

**دو: جوگرافیا مرۆڤی:**

ئەو تایێ جوگرافیێ یە ئەوێ ڤەکۆلینێ لسەر مرۆڤی دکەت ژ لایێ دابەشکرن، خوجه بوون، پێکهاتێن کومەلایەتی و چالاکیێن مرۆڤی و پەیوەندیا ڤان هەموان ب سروشتیڤە.

## نـــەخـــشـــە

پێناسا نەخشەی و رەگەزێن وی:

نەخشە: هویەکا بەرچاڤا فێربوونێ یە ژ ئەگەرێ وێنا و هێمایێن تێدا ناڤی هەموو دیاردێن سروشتی و مرۆڤی یێن سەر روویێ ئەردی ب ساناهی دخوینین و لێ شارەزا دبین، چونکه چاڤێ مرۆڤی بتنێ مەودایەکێ دیارکری دبینیت ژبەر هندێ مرۆڤی پێدڤی ب نەخشەی هەیە بۆ شارەزایی و دیتنا روویەکێ مەزنتر، چونکه نەخشە دیاردێن سەر روویێ ئەردی ب بچووکی نیشان ددەت. گرنگە ئەڤ رەگەزێن خوارێ دنەخشەی دا بن:

## ١- ناڤو نيشان:

پێدڤییە هەر نەخشەیەكی ناڤو نیشانەكێ تایبەت هەبیت، كو ئەڤ ناڤو نیشانە ناڤەرۆكا نەخشەی روون بكەت، و باشترە هەر نەخشەیەك تایبەت بیت ب بابەتەكیڤە وەكی نەخشێ رامیاریێ كیشوەرێ ئاسیا یان نەخشێ رووەكێ سروشتی ل ئەوروپا و چەندین بابەتێن دی پێدڤییە ناڤو نیشانێن نەخشەی ب خەتەكێ روون و مەزن و ل جهەكێ دیار د نەخشەیدا بهێتە نڤێسین.

و پێدڤییە هەر نەخشەكی چوارچوڤەیەك بۆ بهێتە كێشان.

## ٢- پیڤەرێ نەخشەی:

كارێ نەخشەی دیاركرنا روویەكێ بەرفرەهێ دیاردێن سەر روویێن ئەردیە بچووكی لسەر كاغەزێ و ژبەر بچووكیا رووبەرێ كاغەزێ ل چاڤ رووبەرێن دیاردێن سەر ئەردی، ژبەر هندێ پێدڤییە هەر دیاردەكێ دەمێ دئێخینە سەر نەخشەی بهێتە بچووك كرن، ل دوڤ رێژەیەكا گونجای كو دبێژنە ئەوێ رێژێ پیڤەرێ نەخشەی، ئەو ژی پێكهاتیە ژ پەیوەندیا دناڤبەرا دووریا لسەر نەخشێ و دووریا لسەر ئەردی.

## جۆرێن پیڤەرێن نەخشەی:

### أ- پیڤەرێ نڤێسی:

ئەڤ جۆرە ب ساناهیترین و سادەترین جۆرێ پیڤەرێن نەخشەكێشانێیە و بڤی رەنگی دهێتە نڤێسین.

(ئێك سەنتیمەتر بۆ ئێك كیلومەتر)

ئانكو ئێك سەنتیمەتر لسەر نەخشەی بەرامبەر ئێك كیلومەترە لسەر ئەردی.

## ب/ پیڤەرێ ژمارە:

ئەڤ پیڤەرە ب شێوێ کەرت یان رێژە دهێتە نڤێسین، پیڤەرێ کەرتی ب شێوێ کەرت دهێتە نڤێسین بڤی شێوەی ($\frac{1}{100000}$) کو سەرێ کەرتی دبیتە دووری لسەر نەخشەی بەلێ ژێریا کەرتی دبیتە دووری سەر ئەردی، ئانکو ئێك سەنتیمەتر لسەر نەخشەی بەرامبەر ١٠٠٠٠٠ سەنتیمەترایە لسەر ئەردی.
پیڤەرێ رێژەیا دهێتە نڤێسین ب شێوێ رێژە وەك ١ : ١٠٠٠٠٠ ئانکو ١ سەنتیمەتر لسەر نەخشەی بەرامبەر ١٠٠٠٠٠ سەنتیمەترایە لسەر ئەردی.

## ج- پیڤەرێ هێلی:

ئەڤ جۆرە ب شێوێ هێل دهێتە کێشان وەك وێنێ د ژمارە ( ١ ) دا دیار. کو هێلێ بەش بەش دکەن هەر بەشەك ژ وان دووریا سەر نەخشێ دیار دکەت و بەرامبەر دێ ژمارەکێ نڤێسین ب کیلومەتر کو دووریا سەر ئەردی دیار دکەت.پیڤەرێ هێلی ب پیڤەرەکێ باش دهێتە زانین ژبەر کو ب کارئینانا وی یا ب ساناهیە، بۆ دەرئینانا دووریێ پشتی ب راستەکی دووریێ لسەر نەخشێ پیڤین پاش راستەی دێ ئێخینە سەر پیڤەرێ هێلی و ئێکسەر دێ بۆمە دووری دەرکەڤیت کا لسەر پیڤەری چەندە.




ويێنێ ژماره ( ١ ) جۆرێن پیڤەرێن هێلی

### ٣- ئاراسته:

چوار ئاراستێن سەرەکی هەنە (باکوور – باشوور – رۆژهەلات – رۆژئاڤا) د نەخشەی دا ئاراستێ باکوور ب شێوێ تیرەکا بچووك دهێته کێشان ل بەشێ سەری یێ نەخشی، و دیارکرنا ئاراستێ باکوور زۆرێ گرنگه ژبەر کو ب هاریکاریا باکووری دێ شێین ئاراستێن دی دیار کەین، ئەگەر بەرامبەر نەخشەکی راوەستین و ب هاریکاریا ئاراستێ باکوور دێ شیێن باشووری دیار کەین ژ بەر کو بەروڤاژی باکووره و دەستێ راستێ دێ بیته رۆژهەلات و دەستێ چەپێ دێ بیته رۆژئاڤا.



ويّنىّ ژماره ( ٢ ) ويّنىّ ئاراستان ديار دكەت

## ٤- كليلا نەخشەى:

دشياندا نينه هەموو تشت لسەر نەخشەى بهيّنه نڤيّسين ژ بەر ڤىّ چەندىّ رەنگ و هيّما و هيّل دهيّنه بكارئينان لسەر نەخشىّ بۆ روونكرنا دياردا و ل ژيّريا نەخشەى ژ لايىّ چەپىّ چارگۆشەك يان لاكيّشەك دهيّته كيّشان دبيّژنىّ (كليلا نەخشەى) هەموو رەنگ و هيّمايىّن د ناڤ نەخشەى دا روون دكەت.

رەنگ ئيّك ژ وان ريّكايە ئەويّن دهيّنه ب كارئينان بۆ روونكرنا دياردیّن جوگرافيیّن سەر ئەردى، كو چيا ب رەنگىّ قەهوائى دهيّنه نيشان دان و دەشت ب رەنگىّ كەسك و يان ب رەنگىّ زەر و ئاڤ ب رەنگىّ شين دهيّته رەنگكرن، كو رەنگىّ شينىّ تارى بۆ ئاڤا زەرياييّن كوور بكار دهيّت. و شينىّ ڤەبووى بۆ ئەو جهيّن كو كووريا ئاڤىّ كيّمترە، و سنوورىّ دەريا و زەريا ب هيّلەكا شينىّ تارى دهيّته كيّشان

کو هێلەکا خاروڤیچە کو هێلا گەهاندنا ئاڤا دەریا و زەریا ل گەل هشکاتییێ یە و دبێژنێ (هێلا کەناری).




نەخشێ ژمارە ( ١ )

## جۆرێن نەخشان:

نەخشە چەند جۆرەکن هەر ئێك نواندنا دیاردەکێ یان زێدەتر دکەت (سروشتی بن یان مرۆڤی) و گرنگترین جۆرێن نەخشان ئەڤەنە:

### نەخشێن سروشتی:

ئەو نەخشەنە ئەوێن دیاردەکا سروشتی ب خۆڤە دگرن وەکی:

#### أ- نەخشێ بلند و نزمیا روویێ ئەردی:

ئەڤ نەخشە بلند و نزمیا روویێ ئەردی بخۆڤە دگریت، وەکی چیا و بانی و دەشت و دول و نهاڵ و رووبەرێ ئاڤ و هشکاتییێ کو رەنگ گەلەك دهێنە بکارئینان د ڤان جۆرە نەخشاندا.

## ب- نەخشێ ئاڤ و هەوای:

ئەڤ نەخشە دیاردا ئاڤ و هەوای لسەر ڕوویێ ئەردی دیار دکەت وەکی پلێن گەرمی و پەستانا هەوای ڕوویێن بای و شهێ و بارانان د ڤان جۆرێن نەخشاندا رەنگ کرن و سیبەر و هێل بکار دهێن بۆ دیارکرن و دابەشکرنا دیاردا ئاڤ و هەوای لسەر ڕوویێ ئەردی. تەماشەی (سەیری) نەخشێ ژمارە ( ٢ ) بکە



نەخشێ ژمارە ( ٢ ) نەخشێ دابەشکرنا تێکرایێ باران بارینێ یە ل عێراقێ

## ج- نەخشێ دەریا و زەریا:

ئەڤ جۆرێ نەخشا دابەشبوونا دەریا و زەریایان نیشان ددەت و گرنگییێ ژی دەتە کوراتیا وان کو ب ڕێکا رەنگێ شین پلا کووراتییێ دیار دکەت و کلیلا رەنگان بۆ دروست دکەت. هەروەسا چون و ئاراستا تەوژمێن دەریایان و دیار دبن دێ سروشتییێ ل دەریای ڕوون دکەت.

## د- نەخشێ زیندەیی:

ئەڤ جۆرە نەخشە دابەشبوونا جۆرێن رووەك و گیانەوەران بخۆڤە دگریت لسەر روویێ ئەردی ب شێوێ رەنگی یان هێما یان سیبەر وەکی ل نەخشێ ژمارە ( ٣ ) هاتیە دیارکرن.

نەخشێ ژمارە
( ٣ )




دابەشبوونا رووەکێ سروشتی ل عیراقێ

## ٢- نەخشێ مرۆڤی:

ئەڤ جۆرێ نەخشان نواندنا دیاردێن مرۆڤی دیاردکەت وەکی:

### أ- نەخشێ دابەشکرنا ئابووری:

ئەڤ نەخشە پیتەی ددەتە لایێن ئابووری وەکی کشتوکاڵ و گیانەوەر و کانزا و پیشەسازی و بازرگانی و رێکێن ڤەگوهاستنێ و پیتەدان ب دابەشکرنا وان لسەر روویێ ئەردی بکارئینانا رەنگ و سیبەر و هێما د ڤان جۆرە نەخشان دا تەماشەی نەخشێ ژمارە ( ٤ ) بکە




**نەخشێ ژمارە ( ٤ )**

**نەخشێ سامانێ کانزایە ل هەرێما کوردستانا عیراقێ**

## ب- نەخشێ خۆجهبوونێ:

**ئەڤ جۆرە نەخشە پیتەی ددەتە خۆجهیا ژ لایێ دابەشبوون و چڕی و پێکهاتنا وان، هەروەسا پیتەی ددەتە ئاڤەدانکرنا سەنتەرێن گوند و باژێرا برێکا بکارئینانا رەنگا و هێلا و سیبەرا و خالا و بازنا لسەر نەخشێ.**

## ج- نەخشێ رامیاری:

ئەڤ جۆرە نەخشە یەکێن رامیاری (دەولەت) دیار دکەت وەك وەلاتا و دەولەتا بکارئینانا رەنگێن جودا جودا بۆ هەر دەولەتەکێ رەنگەکێ تایبەت دێ بکارئینین بۆ جوداکرنا وان

## نەخشێن مێژوویی:

ئەڤ جۆرە نەخشە دیاردێن سروشتی بن یان مرۆڤی بن د دەمێن بۆری دا دیار دکەن، وەك نەخشێن جەنگان یان رێکێن بازرگانیێن کەڤن و دڤان نەخشان دا رەنگ و سیبەر و هێل و تیرە (سهم) دهێنە ب کارئینان. تەماشەی (سەیری) نەخشێ ژمارە ( ٥ ) بکە.




نەخشێ ژمارە ( ٥ )

## دیارکرنا هندەك دیاردێن جوگرافی لسەر نەخشەی:

دیاردێن جوگرافی هێمایێن تایبەت هەنە بۆ دیارکرنێ لسەر نەخشەی ئەڤەژی چەند هێمایەکن:

أ- رێکێن هاتن و چوونێ: لسەر نەخشەی هێمایێن تایبەت هەنە وەك رێکێن ئاسایی یێن ڤێرکری بۆ ترومبێلا لسەر نەخشەی ب شێوێ هێلێن سوور دێ دروست کەین بەلێ ئەگەر رێکەکا نە ڤێرکریبیت ب شێوێ هێلێن رەش یێن ژێك ڤەبووین دێ کێشین. و هێلێن ئاسنی یان رێکێن شەمەندەفرا لسەر نەخشەی ب شێوێ دوو هێلێن زراڤ و رەش کو لگەل ئێك دهەڤ تەریب بن یان هەردوو هێل بەرامبەری ئێك بن.

ب- باژێر: لسەر نەخشەی ب شێوێ بازنەکێ مەزن و بچووك دروست دکەین بەلێ بۆ پایتەختا ب شێوێ چوارگۆشەکێ بچووك و بازنەك د ناڤدا بیت دێ دروست کەین.

ج- سنوور: سنووری ب شێوێ هێلێن سووریێن پان یێن ژێك ڤەکری دروست دکەین، بەلێ ئەگەر سنوورێ کارگێری بیت دێ ب شێوێ هێلێن رەش یێن ژێك ڤەکری دروست کەین.

د- ریبار: ریبارێن وەرزی (کاتی) ب شێوێ هێلێن شین یێن ژێك ڤەکری دروست دکەین.

ه- رووبەرێن ئاڤێ: دەریایێن بچووك یێن وەرزی (کاتی) و گۆمێن ئاڤێ ب شێوێ پارچەکا شینێ ڤەبووی و ب هێلێن ژێك ڤەبوی دێ هێنە پرکرن. هێمایێن رەنگان لسەر نەخشێ زۆر دگرنگن ژبەرکو زمانێ نەخشەینە برێکا ڤان هێمایا ئەم دشێین ب ساناهی نەخشەی بخوونین تێبگەهین. نەخشێ ژمارە ( ٦ ).




نەخشێ ژمارە
( ٥ )

## زاراڤ

| | |
|---|---|
| ١- جوگرافی | Geography |
| ٢- زانست | Scince |
| ٣- ئەرد | Earth |
| ٤- جوگرافیا سروشتی | Natural Geography |
| ٥- جوگرافیا مرۆڤی | Human Geography |
| ٦- نەخشە | Map |
| ٧- ناڤو نیشان | Title |
| ٨- پیڤەر | Scale |
| ٩- باکوور | North |
| ١٠- باشوور | South |
| ١١- رۆژهەلات | East |
| ١٢- رۆژئاڤا | West |
| ١٣- هێما | Symbol |
| ١٤- رەنگ | Colour |
| ١٥- بازنە | Circle |
| ١٦- خال | Point |
| ١٧- هێل | Line |

# پسیارێن پشکا ئێکێ

پ١/ ئەڤێن ل خوارێ پێناسە بکە:

١- زانستێ جوگرافی ٢- جوگرافیا مرۆڤی

٣- نەخشە ٤- پیڤەرێ نەخشەی

٥- نەخشێ رامیاری ٦- نەخشێ مێژوویی

پ٢/ ڤان بۆشایێن ل خوارێ ب پەیڤەکا گونجای پر بکە:

١- بوارێن ڤەکۆلینا جوگرافییێ ب گشتی دوو جۆرن.

١- ---------- ٢- ----------

٢- تایێن جوگرافیا سروشتی ئەڤەنە:

١- ---------- ٢- ---------- ٣- ----------

٣- تایێن جوگرافیا مرۆڤی ئەڤەنە:

١- ---------- ٢- ----------

٣- ---------- ٤- ----------

٤- گرنگترین رەگەزێن نەخشەی پێکدهێن ژ:

١- ---------- ٢- ---------- ٣- ----------

٥- گرنگترین پیڤەرێن نەخشەی ئەڤەنە:

١- ---------- ٢- ---------- ٣- ----------

٦- پیڤەرێ کەرتی ژ ---------- و ---------- پێك دهێت.

٧- ڕەنگێ ئاسایی جادا ڤێرکری لسەر نەخشێ ------------- و ڤێرنەکری ب هێلێن ------------- یێن ------------- هێما دهێتە دانان.

٨- لسەر نەخشێ ریبارێ وەرزی ب شێوێ ------------- دهێتە کێشان.

٩- ب شێوەکێ گشتی نەخشە دوو جۆرن.

١٠- نەخشێن سروشتی ئەڤەنە:

١- -------------    ٢- -------------

٣- -------------    ٤- -------------

پ٣/ ئەگەرێن ئەڤێن خوارێ دیاربکە:

١- هەر ژ کەڤندا مرۆڤی زانیاریێن جوگرافی یێن زانین؟

٢- نەخشە گرنگترین هۆیێ ب چاڤ دیتنە بۆ فێربوونێ؟

٣- پیڤەرێ هێلی ژ جۆرێن پیڤەرێن دی باشترە؟

**چالاکی:**

قوتابیێن خۆشتڤی بزاڤێ بکە نەخشەکی چێکە بەلێ مەرجێن گرنگێن نەخشەی تێدابن ب سەرپەرشتیا مامۆستایێ وانێ.

## پشکا دووێ
## ئەرد و پەیوەندی ب گەردوونی ڤە

### پێشەکی:

بەرێ باوەری هەبوو کو ئەڤی گەردوونی دووریەکا سنووردار یا هەی، هژمارا ستێرا گەلەك نینن، بەلێ پێشکەفتنا زانیاریا ستێر نیاسیێ و بوشاییا ئەسمان نیاسی و داهێنان و پێشکەفتنا ئامیرێن دیتنا ستێرا بۆ ئەگەرێ دیتنا ژمارەکا گەلەك ستێرا و هەساروکا کو گەلەك ژ ئەردێ مە د دوورن.

خەلکێ دێرینێ دۆلا ناڤبەرا دو رووباران و دۆلا نیل، هەروەسا ئەوێن سەردەمێ ئیسلامێ هوسا دزانی کو رۆژ چەقێ گەردوونیە، هەروەسا ئەو باوەری ل ئەوروپا بەلاڤ بوو کو هەتا دوماهیا سەدێن ناڤەراست دگۆتی ئەو ئەردێ ئەم لسەر دژین چەقێن گەردوونی پێك دئینیت، بەلێ پشتی پەیدابوونا ڤەکۆلینێن (کۆپەرنیکوس) و (گالیلۆی) لسەر دەمێ راپەرینێ ل ئەوروپا ل سەدێن ( ١٥ - ١٦ ) زایینی ئەو چەندە هاتە چەسپاندن کو ئەرد هەسارەیەکە ب سەر رۆژێ ڤە وەکی هەموو هەسارێن دی ل دۆر دزڤرن و ژمارا ئەڤان هەسارا (نەهن): (عەتارد، زوهرە، ئەرد، مەریخ، موشتەری، زوحەل، ئورانوس، نیپتون، بلۆتۆ). تەماشەی وێنێ ژمارە ( ٣ ) بکە.

دووریا ئەردی ژ رۆژێ د پلا سیێ دا دهێت پشتی هەردوو هەسارا عەتارد و زوهرە، ئەڤێ دووریێ وەل ئەردی کر کو ب رادەیەکێ ناڤنجی گەرما رۆژێ وەربگریت و ئەو رادەیە بەس بیت بۆ هەبوونا ژیانێ لسەر ئەردی.



وێنێ ژمارە ( ٣ ) کۆمەلا رۆژێ

## هەسارێن گەروك د ڤان خالاندا وەکی ئێکن:

١- شێوێ خر یان نێزیکی خریێ.
٢- زڤرینا ل دور رۆژێ چەند خولگەیێن جێگیردا، بەروڤاژی زڤرینا میلێ دەمژمێری.
٣- گەرمیێ و رۆناهیێ ژ رۆژێ وەردگرن ئانکو نێزیکترین هەسار ژ رۆژێ ژ هەمووا گەرمترە.

## شێوێ ئەردی:

شارستانیێن کەڤن هزرا وان ئەو بوو کو شێوێ ئەردی وەکی گۆیەکێ یە، ل دۆلا ناڤبەرا دو رووباران (میسوبوتامیا) دگۆت کو (تلەپەکێ بازنی یە)، ل دۆلا نیل دگۆت (لەشەکێ کوورە) و گریکیان (یونانیان) وەکی میسریێن کەڤن بەحسێ ئەردی کریە.

بیرو باوەرێن راست دەربارەی شێوێ ئەردی لسەر دەستێ زانایێن موسلمان پەیدابوون وەك خەوارزمی و ئیدریسی کو گویەکا ئەردی ژ زیڤی دروست کربوو.

پێشکەفتنا شارستانیا مرۆڤایەتی گەلەك بەلگە بدەست کەفتن ئەو چەندە سەلماند کو ئەردێ گوروڤرە وەکی گویەکێیە، ئەو بەلگێن خرا ئەردی دسەلمینن ئەڤەنە.

١- لدویڤ ئێك هاتنا شەڤ و رۆژا.

٢- خواربوونا ئاسۆ و جووت بوون ل گەل ئەردی د چاڤی بینەریدا.

٣- دەرکەفتنا بەشێن بلندێن پاپورا بەری بەشێن دی دەمێ ل رەخێ دەریا نێزیك دبن وەك د وێنێ ژمارە ( ٤ ) دا دیار.

٤- گەریانا ماجەلانی پشتی گەریانەکا دەریایی یا چەند سالی ڤەگەریا هەر وی جهێ ژێ چووی.

٥- مرۆڤ ب ئەگەرێ گەریانێن ئەسمانی شیا وێنێ ئەردی ل بلندیەکا زور بگریت وەك د وێنێ ژمارە ( ٥ ) دا دیار.




وێنێ ژمارە ( ٤ )

(دەرکەفتنا پاپورا بەرزە ژ ئەگەرێ خریا ئەردی)

## هەسارا جیاوازیا هەی دگەل ستێرا دڤان خالا دا:

١- ستێر لەشەکێ گازییە، بەلێ هەسارە لەشەکێ رەقە.
٢- ستێر بخۆ گەرمیێ و رۆناهیێ بەرهەم دئینیت، لێ هەسار گەرمیێ و رۆناهیێ وەردگریت.



وێنێ ژمارە ( ٥ )
(خرا ئەردی وەك ل هەیڤێن دەستکرد دهێتە نیشانکرن)

بەلێ پێشکەفتنا زانستی ئەو چەسپاند کو شێوێ ئەردی ب تمامی یێ خر نینە، بەلکو نێزیکی خرییێ یە.

## لڤينێن ئەردى:

ئەرد و هەسارێن دى د لڤينەكا بەردەوام دانە، ژ ئەنجامێ زڤرينا ئەردى و هەسارێن دى ل دۆر رۆژێ جهێ خۆ بەردەوام ل ئەسمانى دگوهۆرن، ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنێ هەسارێن گەروك، ئەردى چەند لڤين هەنە ژ وانا لڤينا رۆژانە و لڤينا سالانە.

## ١- لڤينا رۆژانە:

ئەرد ل دۆر تەوەرێ خۆ يێ خوارێ بەردەوام بەرامبەر رۆژێ دزڤريت كو خاريا وى تەوەرى (٢٣,٥) پلە يە لسەر ئاستێ وێ ستوونا هاتيە خوارێ بۆ ئێك لا و ناهێتە گوهۆرين و مەبەست ژ تەوەرێ ئەردى ئەو هێلا ئاشوپيە (خەيالى) ئەوا دناڤ جەرگێ ئەرديدا دبۆريت و هەردو جەمسەرێن باكوور و باشوور دگەهينيتە ئێك، زڤرينا رۆژانە ل دۆر تەوەرى د (٢٤) دەمژمێرا دا تمام دكەت، بەلێ ئەم هەست ب ڤێ لڤينێ ناكەين ژ بەر كو ئەرد و هەر تشتێ لسەر روويێ ئەردى بۆ ئێك لا و ب ئێك لەزاتى دلڤن و ژ ئەنجامێ لڤينا رۆژانە يا ئەردى دياردا ل دويڤ ئێك هاتنا شەڤێ و رۆژێ پەيدا دبيت. و ئەڤ دياردە ژ بەر ڤان ئەگەرا رووددەت:

أ- شێوێ خراتيا ئەردى.

ب- زڤرينا ئەردى ل دۆر تەوەرێ خۆدا هەردەم خواريا ڤى تەوەريە بۆ لايەكى.

ج- بەردەواميا سەرچاوێ رۆناهيێ (رۆژ).

ئەگەر ئەرد يێ راوەستياى با و نە زڤريبا نيڤا ئەردى دا رۆناهى (رۆژ) بيت و نيڤا ئەردى دا تارى (شەڤ) بيت.



وێنێ ژمارە ( ٦ )
وێنێ شەڤ و رۆژا

## ٢- لڤینا سالانە :

دەمێ ئەرد ل دۆر رۆژی دزڤریت ل جهێ خۆ نا راوەستیت، بەلكو لسەر خۆلگەیەكێ جێگیر ل دۆر رۆژێ دزڤریت، ئەڤ زڤرینە ب سالەكێ تەمام دبیت، تێبینی دهێتە كرن كۆ تیرۆژكا رۆژێ ب ستوونی لسەر كەمەرا ئەردی (هێلا یەكسانی) نا مینیت، بەلكو تیرۆژكا ستوونی دناڤبەرا هەردو خولگەی كێڤژالە و كارك ب درێژیا سالێ دهێت و دچیت ئەڤەژی ژ بەر خارییا تەوەرێ ئەردییە وەكی مە بەری نوكە گۆتی، ئەڤێ دیاردێ دبێژنێ (لڤینا روالەتیا رۆژێ) ژ ئەنجامێ لڤینا سالانە یا ئەردی دیاردا هەر چار وەرزا پەیدا دبیت.

د شیاندایە ئەگەرێن روودانا هەر چار وەرزێن سالێ د ڤان خالاندا کورت بکەین:

أ- زڤرینا ئەردی ل دۆر رۆژێ ل **٣٦٥** رۆژا دا.

ب- شێوێ وەکی هێکێ یێ ئەو خولگەیا ئەرد لسەر دزڤریت ل دور رۆژێ.

ج- خواریا تەوەرێ (محور) ئەردی (رەوشا ئەردی) ب رێژا **٢٣,٥** پلە. تەماشەی وێنێ ژمارە ( ٧ ).

ل دویف پێك هاتنا چوار وەرزێن سالێ لسەر هەردو نیڤێن ئەردی خراتیا ئەردی روون دکەت.




وێنێ ژمارە ( ٧ )
چوار وەرزێن سالێ

## بازنێن پانی و هێلێن درێژیێ:

### ١- بازنێن پانی:

ئەو بازنێن ئاشوپینە (خەیالینە) ئەوێن ناهێنە دیتن و ل دۆرماندۆری خرا ئەردی دانە، ژمارا وان ١٨٠ بازنن، ٩٠ بازنە ل نیڤا باکووری و ٩٠ بازنێن دی ل نیڤا باشووری و مفایێ ڤان بازنا بۆ زانینا هەرێمێن ئاڤ و هەواینە ل جیهانێ ب شێوەیەکێ گشتی.

## * نیشانێن بازنێن پانی:

أ- بازنێن پانی بازنێن تەمامن ل دۆرمانی ئەردی و خریا ئەردی دانە.

ب- پەیڤا باکوور و باشوور لگەل بازنێن پانی دهێنە بکارئینان وەکو دبێژن بازنێ پانی ٤٠ باکوور یان ٤٠ باشوور.

ج- ئەگەر ل هێلا یەکسان بەرەف جەمسەرا بچین ئەڤ بازنێن پانی دێ بچووك بن، ئەڤ چەندە وێ دگەهینیت بازنا هێلا یەکسانی مەزنترین بازنەیە و بچووکترین بازنە بازنەیا ٩٠.

د- بازنێن پانی دگەل ئێك و دو د تەریبن (بەرامبەر ئێکن) و ئەگەر درێژ کەین نا گەهنە ئێك و دوو.

ه- بتنێ هێلا یەکسانی ب هێلا سفر یان هێلا بناغێ دهێتە دانان و هیچ هێلەکا دی جهێ وێ ناگریت، چونکی مەزنترین بازنا خرا ئەردی یە و دکەتە دو بەشێن وەك ئێك (یەکسان).

د وان بازنێتن پانی یێن سەرەکی دا مفا بۆ ڤەکۆلینێن ئاڤ و هەوای هەنە، بازنا هێلا یەکسانی، بازنا پانی ٢٣,٥ باکوور کو ب خۆلگا کێڤژاله دهێته نیاسین و بازنا پانی ٢٣,٥ باشوور کو ب خولگا کارك دهێته نیاسین، هەروەسا هەردو بازنێن جەمسەرا، بازنا پانی ٦٦,٥ باکوور کو ب بازنا جەمسەرێ باکوور دهێته نیاسین و بازنا پانی ٦٦,٥ باشوور کو ب بازنا جەمسەرێ باشوور دهێته نیاسین، تەماشەی شێوێ هژمارە (١٤) بکە.

## ٢- هێلێن درێژی:

ب راستی نیڤ بازنە یان کڤان ئەڤەژی هەر د ئاشوپینە (خەیالینە) لسەر خرا ئەردی کێشاینە، هەردو جەمسەرێن باکوور و باشوور دگەهیننە ئێك، ژمارا ڤان هێلا ٣٦٠ هێلن، رۆژهەلات ١٨٠ و رۆژئاڤا ١٨٠ مفایێ ڤان هێلا بۆ زانینا دەمی یە ل نافچێن جودا جودا لسەر خرا ئەردی.

## نیشانێن هێلێن درێژی:

أ- نیڤ بازنێن د جەمسەردا دگەهنە ئێك، ئانکو ئەڤ بازنە د تەریب نینن.

ب- پەیڤا رۆژهەلات و رۆژ ئاڤا دگەلدا دهێنە بکارئینان چونکی ئەڤەژی وەك بازنێن پانی هژمارا وان دوبارە دبیتن وەك دبێژین هێلا ٤٠ پێدڤیە دیار بکەین ٤٠ رۆژهەلاتە یان رۆژئاڤایە.

ج- دهێلێن درێژیدا هەر هێلەکا بیت چێدبیت ببیتە هێلا سفر و ببیتە بناغە (شەنگستە) بۆ دابەشکرنا هێلێن دی، نوکە هێلا سفر ئەو هێلە یا د سەنتا گەردوونی یا (گرینویج) دا دبوریت ئەوا دکەڤیتە نێزیکی باژێرێ لەندەن ئەڤ هێلە ب رێکەفتنا دەولەتان کرە هێلا بناغە.

## پەیوەندی دناڤبەرا هێلێن درێژی و دەمی:

وەکی دزانین گوویا زەوی ل دۆر تەوەرێ خۆ دزڤریت د ٢٤ دەمژمێرادا زڤرینا خۆ تەمام دکەت، زڤرینا ئەردی ژ رۆژئاڤا بەرەڤ رۆژهەلاتە، بیرۆکا پیڤانا دەمێ باژێر و دەڤەرا لسەر ڤێ یا دروست بووی زڤرینا عەردی د ٢٤ دەمژمێراندا تمام دبیت، دڤی دەمیدا هەموو هێلێن درێژی بەرامبەری تیرۆژکا رۆژێ دبن، ئانکو د دەمێ ٢٤ دەمژمێراندا ٣٦٠ هێلێن درێژ بەرامبەری تیشکا رۆژێ دبۆرن. ئەرێ د دەمژمێرەکێدا چەند هێل دبۆرن؟

بەرسڤ ٣٦٠ ÷ ٢٤ = ١٥ هێل رامان ئەوە کو ب دەمژمێرەکێ ١٥ هێل بەرامبەری تیشکا رۆژێ دبۆرن، هەکە د ئێك دەمژمێر دا ١٥ هێل ببۆرن ئەرێ ئێك هێل ب چەندێ دبۆریت ٦٠ ÷ ١٥ خولەك = ٤ خولەك چونکە ئەرد ژ رۆژئاڤا بۆ رۆژهەلاتی دزڤریت، ئانکو دەڤەرێن رۆژهەلاتی ل دەمێ رۆژهەلاتی زیتر رۆژ لێ د هەلێت ل چاڤ دەڤەرێن رۆژئاڤا ب رامانەکا دی دەڤەرێن رۆژهەلاتی دەم پێشترە ل چاڤ دەڤەرێن رۆژئاڤای بۆ هەر هێلەکا درێژی ماوێ (٤) خولەکا.. تەماشەی وێنێ ژمارە (٨) و ژمارە (٩) بکە.




وێنێ ژمارە ( ٨ )
بازنێن پانی

وێنێ ژمارە ( ٩ )
هێلێن درێژی

## زاراڤ

| | |
|---|---|
| ١- هەیڤ | Moon |
| ٢- رۆژ | Sun |
| ٣- گەرم | Heat |
| ٤- رۆناهی | Light |
| ٥- ستێر | Star |
| ٦- هەسارە | Planet |
| ٧- زڤراندنا ئەردی | Rotation of Earth |
| ٨- وەرز | Season |
| ٩- بازنێن پان | Parallel Latitude |
| ١٠- هێلێن درێژی | Meridians Latitude |
| ١١- هێلا یەکسانی (کەمەری) | Eguator |
| ١٢- خولگا کێڤژالەی | Tropic of Cancer |
| ١٣- خولگا کارکی | Tropic of Capricorn |
| ١٤- بازنێن جەمسەرێ باکوور | Artic Circle |
| ١٥- بازنێن جەمسەرێ باشوور | Antarctic Circle |
| ١٦- جەمسەرێ باکوور | North Pole |
| ١٧- جەمسەرێ باشوور | South Pole |

## پرسیارێن پشکا دووێ

پ١/ ئەڤێن خوارێ پێناسە بکە:

١- بازنێن پانی ٢- هەسارێن گەرۆك ٣- تەوەرێ ئەردی

پ٢/ راست و خەلەتیێن ئەڤێن خوارێ دیاربکە دگەل راستییا خەلەتیا.

١- پێشکەفتنا زانیاری چەسپاند کو شێوێ ئەردی ب تمامی یێ خرە:

٢- زڤرینا ئەردی ل دویڤ خۆدا وەکی زڤرینا میلێ دەمژمێرێ یە.

٣- چەند بەرەڤ باکوور و باشوورێن هێلا یەکسانی بچین شێوێ بازنێن پانی بچووك دبن.

٤- مفایێ بازنێن پانی بۆ دیارکرنا جھ و دەمییە لسەر ئەردێ خر.

٥- هەسارێن گەرۆك گەرمی و رۆناهیێ ژ رۆژێ وەردگرن.

پ٣/ ئەگەرێن ئەڤێن خوارێ دیار بکە:

١- تیرۆژکا رۆژێ ب ستوونی یان نێزیکی ستوونی د ناڤبەرا هەردو خولگێن کێڤژاله و کارك ب درێژیا سالێ دهێت و دچیت.

٢- هەست نەکرن ب لڤینا ئەردی.

٣- هەبوونا ژیانێ لسەر ئەردی.

پ٤/ ئەڤان ڤالاهیێن خوارێ پربکە:

١- دووریا ئەردی ژ رۆژێ د پلا ------------------ دهێت پشتی هەردو هەسارێن ------------------ و ------------------.

٢- ژمارا هەسارێن گەرۆکێن ل دور رۆژێ دزڤرن ------------------ کو نێزیکترین هەسار ژ رۆژێ ------------------ و دوورترین ------------------.

٣- ژ ئەنجامێ لڤینا سالانە یا ئەردی دیاردا ------------------ پەیدا دبیت و ژ ئەنجامێ لڤینا رۆژانە یا ئەردی دیاردا ------------------ پەیدا دبیت.

پ٥/ بەحسێ ل دویڤ ئێك هاتنا چار وەرزێن سالێ ل هەردو نیڤێن ئەردێ خر بکە پاشی ب وێنە دیاربکە.

پ٦/ جوداهی د ناڤبەرا هێلێن درێژ و بازنێن پانی چنە؟ ب وێنەی دیاربکە.

# پشكا سیێ
# سروشتێ پێكهاتنا تیڤلێ ئەردی

وەك د زانین ماددە د سروشتی دا ب سێ شێوا دهێتە دیتن ئەوژی رەق و شل (روون) و گاز، بەرگێن ئەردی ژی ئەڤ (٣) شێوێن وەرگرتی. ئانكو ئەم دشێین بێژین بەرگێن دەوروبەرێن ئەردی ئەڤەنە:

## ١- بەرگێ رەق ( بەرگێ بەری ):

ئەڤە رووبەرێ هشكاتیێ یا خرا ئەردیە ئانكو كیشوەرن، پێك دهێت ژ كەڤر و بەرا كو هندەك ژ ئەگەرێ بۆرینا سالان هووربوون و بۆینە (ئاخ) ئەڤێ ئاخێ پترییا بەرگێ رەق یا نخافتی و رێژا ئەڤی بەرگی دگەهیتە نێزیكی ٣٠٪ ژ رووبەرێ خرا ئەردی.

## ٢- بەرگێ ئاڤێ:

ئەو پشكا خرا ئەردی یە ئەوا ب ئاڤێ هاتیە نخافتن، مەبەست ژ ڤی بەرگی زەریا و دەریا و دەریایێن بچووكن و كو رووبەرەكێ مەزن یێ خرا ئەردی ڤەگرتیە، دگەهیتە نێزیكی ٧٠٪ ژ رووبەرێ خرا ئەردی.

## ٣- بەرگێ گازێ:

ئەڤ بەرگە دكەڤیتە دەوروبەرێ هەموو خرا ئەردی ب ئاڤ و هشكاتی ڤە ژ بەر كو بارا پتر یا پێكهاتنا وێ گازە وەكە گازا نایتروجین و ئوكسیجین و دووانی ئوكسیدێ كاربون و هەلما ئاڤێ ژ بەر هندێ ب ڤی ناڤی هاتیە نیاسین.

## ٤- بەرگێ زیندی:

ئەڤی بەرگی چ راستی بۆ نینە، بەلێ ژ تێكەلبوونا ئەوان (٣) بەرگێن سەری یێ دروست بووی، بۆ ئەگەرێ دروست بوونا ژیانێ لسەر خرا ئەردی وەكی ژیانا مرۆڤی و گیانەوەر و رووەكی، هەر ژ بەر ڤێ چەندێ هاتە ناڤ كرن ب بەرگێ زیندی.

## دابەشبوونا گشتی یا هشکاتی و ئاڤێ:

هشکاتی و ئاڤ روویێ خرا ئەردی پێك دئینن. هشکاتی ئەو رووبەرێن خرا ئەردینە کە بلندترە ژ ئاستێ روویێ دەریا و ئاڤێ نە نخافتینە و ئەڤان رووبەرا دبێژنێ کیشوەر (قارات)، بەلێ ئاڤ دەڤەرێن نزمێن بەرفرەهـ ڤەدگریت کو دبێژنێ زەریا و دەریا و دەریایێن بچووك.

## نیشانێن دابەشکرنا ئاڤ و هشکاتیێ:

ئەگەر تەماشەی نەخشێ هژمارە (٧) و هژمارە (٨) بکەین کو دابەشکرنا هشکاتی و ئاڤێ لسەر خرا ئەردی نیشان ددەن دێ ئەڤە بۆمە دیاربن:

١- رووبەرێ هشکاتیا خرا ئەردی ژ رووبەرێ ئاڤێ کێمترە، ژ بەر کو رووبەرێ هشکاتی نێزیکی ٣٠٪ ێ ژ روویێ ئەردی دگریت، بەلێ رووبەرێ ئاڤێ نێزیکی ٧٠٪ ێ ژ روویێ ئەردی دنخێڤیت.

٢- پرانیا هشکاتیێ دکەڤیتە نیڤا باکوورێ خرا ئەردی و ٥٢٪ ێ نیڤا باکوورێ خرا ئەردی هشکاتیە و بتنێ ٤٨٪ ێ ئاڤ ڤەدگریت، لێ ئەڤ دابەشکرنە ل نیڤا باشوورێ خرا ئەردی بەروڤاژییە، رێژا رووبەرێ ئاڤێ دگەهیتە ٩٤٪ ێ لێ رووبەرێ هشکاتی بتنێ ٦٪ یە.

٣- بەشێ هشکاتیا ل نیڤا خرا باکووری وەسا دیار دبیت کۆ پێکڤە دگرێداینە. بەلێ د نیڤا خرا باشووری دا ژێك دوور دبن.




نەخشێ ژمارە ( ٧ )

دابەشکرنا ئاڤ و هشکاتیێ ل جیهانێ

نیڤا خرا ئەردی یا هشکاتی — نیڤا خرا ئەردی یا ئاڤ



نەخشێ ژمارە ( ٨ )

دابەشکرنا هشکاتی و ئاڤێ ل هەردو نیڤێن خرا ئەردی

## ١- بەرگێ رەق ( بەرگێ بەری )

کێشوەر ئەو بەشێ هشکاتیێ یێ بەرفرەهە ئەوێ کو ل ئاستێ روویێ دەریایێ بلندتر. و ئەو بەشێ هشکاتیا خرا ئەردی پێك دئینن پێکهاتینە ژ (٧) کیشوەران کو ئاسیا مەزنترین کیشوەرە و ئوستورالیا بچووکترینە. تەماشەی نەخشێ ژمارە (١) بکە

## ناڤێ کیشوەرا و رووبەرێ وان:

| ز | ناڤێ کیشوەری | رووبەر ب کم٢ |
|---|---|---|
| ١ | ئاسیا | ٤٤٤١٣٠٠٠ |
| ٢ | ئەفریقیا | ٣٠٣١٩٠٠٠ |
| ٣ | ئەمریکا باکوور | ٢٤٢٣٤٠٠٠ |
| ٤ | ئەمریکا باشوور | ١٧٨٤٧٠٠ |
| ٥ | جەمسەرێ باشوور | ١٣١٨٠٠٠٠ |
| ٦ | ئەوروپا | ١٠٥٢٧٠٠٠ |
| ٧ | ئوستراليا | ٨٥١١٠٠ |

خشتێ ژمارە ( ١ )

**تێبینی** : ئەڤ خشتە بتنێ بۆ پێزانینایە.

## بلندی و نزمیا روویێ ئەردی ( تۆپوغرافیا ئەردی ):

روویێ کیشوەران ئێك بلنداهی نینە، بەلکو ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی جودایی هەیە، و ئەڤ بلنداهییە ل دویف ئاستێ روویێ ئاڤا دەریا و زەریایان دهێنە پیڤان، گەلەك شێوێن جودا جودا هەنە دبێژنێ بلندی و نزمی ئەڤ شێوە ژی ئەڤەنە:

### أ- دەشت:

ئەو جهن ئەوێن پتریا روویێن وان د راست و لسەر ئاستێ روویێ دەریایێ هند د بلند نینن و هێدی هێدی بلند دبن، ب جۆرەکی د دەشتێن بەرفرەهدا هەست پێ ناکەین، وەکو دەشتێن ناڤبەرا دو رووباران ل عیراقێ و شارەزوور ل هەرێما کوردستانێ.



وێنێ ژمارە ( ١٠ )
وێنێ دەشتەکێ

## ب- دۆل و نهالٚ:

ئەو ئەردێ نزم و تەنگ و لاكێشانەیە، ئەوێ دناڤ بلنداهیا دا درێژ دبن و بارا پتر ژ وان دگەل چیا دا دروست دبن، وەكی نهالا (خەرەند)ی رەواندوزێ، و هندەك نهالێن دی یێن هەین كو ب هاریكاریا هندەك ئەگەرێن دی دروست دبن وەك شكاندن و هریان و داچوونێ.

## ج- بانی:

ئەو جه و ئەردێن بلندن ئەوێ روویێ وان یێ راست و رەخ و تەنیشتێن زوریا لایێن وان نشیڤن (لیژن)، و هندەك جارا لسەر روویێن وان نهال و چیا گرێن هەین، نموونە بۆ بانی، بانیا (تبت) ل ئاسیا كو بلندترین و فرەهترین بانیە د جیهانێ دا، هەروەسا ل هەرێما كوردستانێ بانیا (مەقان) ل ناڤچا چەمچەمالٚ.

## د- گر و چیا:

گر ئەو جه و ئەردێن بلندن، رەخ و تەنیشتێن زۆر دنشیڤن (لێژن) وەك گرێن (حەمرین) كو دبیتە سنوورێ سروشتی یێ باشوورێ كوردستانێ، بەلێ چیا ئەردەكێ بلندە و هندەك جارا بلنداهیا وی ژ (١٠٠٠) م ب چاڤ ئەردێن دەوروبەردا، كوپیتكێن وان د تیژن و رەخێن وان نشیڤن (لێژن)، هندەك جار چیا پێكڤە دێ وەكی زنجیرێ بن یان دێ بتنێ بن و نموونە بۆ ڤان زنجیرا زنجیرا چیایێ زاگرۆس و پیرەمەگرون ل هەرێما كوردستانا عیراقێ و چیایێن هەمەلایا ل ئاسیا. جوداهی دناڤبەرا چیا و گرا دا د بلندی و نشیڤی و تیژیا كوپیتكاندا هەیە.



وێنێ هژمارە ( ١١ )

وێنێ گرەکی



وێنێ هژمارە ( ١٢ )

وێنێ چیایەکی

## بەرگێ ئاڤێ:

مەبەست ژ ڤی بەرگی رووبەرەکێ ئاڤێ یێ مەزنە وەکی زەریا و دەریا و دەریایێن بچووك، زەریا و رووبەرەکێ ئاڤێ یێ گەلەك بەرفرەهـ و کوورن و ل دور کێشوەرا وەرهاتینە، ئاڤا وان یا راوەستایی نینە بەلکی ب شێوێ پێل د لڤیت، مەزنترین زەریا ژی زەریایێ هێمنە رووبەرێ وێ هندی رووبەرێ هشکاتیا خرا ئەردی دبیت.

بچووکترین زەریا زەریا بەستیێ باکوورە. تەماشەی خشتێ هژمارە (٢) بکە:

## زەریا و رووبەرێن وان:

| ز | ناڤێ زەریای | رووبەر ب ملیون کم٢ |
|---|---|---|
| ١ | پاسفیك (هێمن) | ١٦٥ |
| ٢ | ئەتلەسی | ٨٢ |
| ٣ | هیندی | ٧٣ |
| ٤ | بەستیێ باکوور | ١٤ |

خشتێ ژمارە ( ٢ )

دەریا وەکی زەریایە لێ رووبەرێ وان بچووکترە دەولەتا و بەشێن وان ژێك جودا دکەت، ئەڤەژی دبنە چەند بەشەك. گرنگترینێن وان ئەڤەنە:

### أ- دەریاییێن دەرڤەیی (البحار الخارجية):

دەریایێن دەرەکی: ئەو رووبەرێن ئاڤێنە ئەوێن دکەڤنە ناڤبەرا رەخێن کێشوەر و کۆمێن گزیرتا وەکی گزیرتا کو ژ زەریا جودا دکەت وەکی دەریای چین و دەریای عەرەب.

### ب- دەریایێ ناڤەکی (البحار الداخلية):

ئەو رووبەرێن ئاڤێنە ئەوێن دکەڤنە دناڤ کێشوەرا دا ب دەربەندەکێ تەنگ دگەهنە زەریا وەکی دەریایێ ناڤەراست و دەریایێ سۆر.

### ج- دەریایێن گرتی (البحار المغلقة):

ئەو رووبەرێن ئاڤێنە ئەوێن ژ هەموو لاڤە ب هشکاتیێ دۆرپێچ کری نا گەهنە زەریا، وەکی دەریایا مری و دەریایا قەزوین.

## گرنگیا دەریا و زەریا:

١- دەریا و زەریا رێکێن ڤەگۆهاستنا ئەرزان و ب ساناهی بۆ ڤەگوهاستنا کەل و پەل و هاتن و چوونێ بکار دهێن.

٢- ژێدەرەکێ مەزنە بۆ راڤکرنا ماسیا کو بەشەکێ باشێ خوارنا مرۆڤی ل جیهانێ پێکدئینن.

٣- گەلەك جۆرێن دەرامەتی تێدا هەنە وەکی نەفتێ و خێ و ئیسفەنجی و مەرجانان.

٤- کارتێکرنەکا مەزن یا هەی لسەر ئاڤ و هەوایێن دەڤەرێن دەوروبەرا.

## ٣- بەرگێ گازی:

بەرگێ گازی ئەوژی بەشەکە ژ ئەردی وەکی بەرگێ ئاخێ و بەرگێ رەق گرنگیەکا زور یا هەی ناهێلیت تیشکێن رۆژێ یێن زیانکەر بگەهنە سەر ئەردی، هەروەسا ئەردی دپارێزیت ژ بلندبوون و نزمبوونا زۆرا پلا گەرمێ ناڤەندەکە بۆ ڤەگوهاستنا پێلێن دەنگی و رۆناهیا رۆژێ دروست دکەت.

ئەڤ بەرگە ژ چەند گازا پێکدهێت ژ وان ژی نایترۆجین ٧٨٪ و ئوکسجین ٢١٪ ئانکو هەر بتنێ ئەڤ هەردو گازە ٩٩٪ ژ ئەڤی بەرگی پێکدئینن. گازێن دی و کەرستێن رەق و روون لناڤ ڤی بەرگی

بەس ١٪ ژ ڤی بەرگی پێك دئینن، هەروەسا ژ چەند چینێن ستووراتیا وان جودا پێکدئینن. ل ناڤ ڤی بەرگیدا گوهۆرینێن سەقا و ئاڤ و هەوای رووددەن ژبەر گرنگیا ڤی بابەتی کارتێکرنەکێ لسەر چالاکیێن مرۆڤا دکەت، پیچەك بەرفرەهتر دێ بەحسێ ڤی بەرگی کەین ئەوژی ب رێکا بەحسکرنا سەقا و ئاڤ و هەوای.

### سەقا (الطقس):

رەوشا ئەوی بەرگێ گازیە ئەوێ ل دۆر خرا ئەردی دا هەی ژ لایێ پلا گەرمی، پەستانا هەوای، با، شێ، دابارین، بۆ دەمەکێ کورت ل جهەکێ دەست نیشانکری وەکی کو بێژین سەقایێ ئەڤرۆ ل بازێرێ هەڤلێرێ یێ سارە و بارانە.

### ئاڤ و هەوا (المناخ):

تێکرایا رەوشا ئەوی بەرگێ گازییە ئەوێ ل دور خرا ئەردی دا هەی ژ لایێ پلا گەرمێ بەستنا هەوای، با، شێ و دابارین بۆ ماوەکێ درێژ و جهەکێ دەست نیشانکریدا، وەکی بێژین ئاڤ و هەوایێ دەڤەرێن چیایێن هەرێما کوردستانێ د زڤستانێ دا د سارن و ب بارانن و ل هاڤینێ ژی پلا گەرمی یا ناوەندە (نە گەرمە نە سارە) و یا هشکە، ژ ئەنجامێ ڤان دو پێناسێن کورت یا سەقا و ئاڤ و هەوا بۆمە دیار بوو وەکی ئێکی و جوداهی دناڤبەرا هەردو پێناسا دا یاهەی، وەکی ئێکن کو هەردو بەرگێ گازێ شلۆڤە دکەن ژ لایێ ڤان چار رەگەزێن هاوبەش ل ناڤ بەرا واندا هەی، بەلێ نە وەك ئێکن هندەك جودایی هەنە سەقا بارودوخەکێ کورت یێ بەرگێ گازێ شلۆڤە دکەت بەلێ ئاڤ و هەوا بارودوخی شلوڤە دکەن بۆ ماوەکێ دوور و درێژ تێکرایا بارێ سەقایە.

## رەگەزێن سەقای و ئاڤ و هەوای:

سەقا و ئاڤ و هەوا د چوار (٤) رەگەزا دا ڤەکۆلینا دکەن هەکە دابەش کەین ل دویف گرنگیا وان ئەڤەنە:

١- پلا گەرمی ٢- پەستانا هەوای

٣- با ٤- شێ و دابارین.

ژبەر گرنگیا ڤان بابەتا پیچەك بدرێژتر لسەر هەر ئێك ژ وان دێ ئاخڤین.

## ١- پلا گەرمێ:

ب رەگەزێ ئێكێ یێ سەقا و ئاڤ و هەوای دهێتە دانان، ژ هەمووا گرنگترە و کارتێکرنێ لسەر ئەوێن دیژی دکەت، پەیوەندیەکا ئێکسەر بژیانا هەموو زیندیێن لسەر خرا ئەردی ڤە یا هەی کارتێکرن لسەر ساخلەمی و هەموو چالاکیێن مرۆڤی هەی وەکی کشتوکال، گیانداری و بازرگانی و پیشەسازی.

### أ- ژێدەرێن گەرمێ:

رۆژ گرنگترین و مەزنترین ژێدەرێ گەرمیا هەوایە لسەر خرا ئەردی ب شێوێ وزەی و ب رێکا تیرۆژکا دگەهیتە سەر ئەردی پاشی روویێ ئەردی پیچەکێ ژێ دمێژیت ئەوا دیتر دێ دەتەڤە، هەوایێ دەوروبەرێن خرا ئەردی و پێ گەرم دبیت، ژ بلی رۆژێ لناڤ جەرگێ ئەردی دا ژی برەکا زۆر کێم ددەتە بەرگێ گازی ئەوژی ب رێکا گرکان رودەرکەفتا گەرماتیا، برەکا زۆر کێم یا ڤێ گەرمێ ژ چێکرنا مرۆڤی یە. سوتەمەنیێ بکاردئینن بۆ پیشەسازیا و خۆ پێ گەرم دکەن و پێدڤیێن خۆ یێن دی یێن ژیانا خو یا رۆژانە.

## ب- ئەو ئەگەرێن کار ل پلا گەرمیا هەوای دکەن:

ئەو پلا گەرمێ ئەوا ژ تیرۆژکا رۆژێ بەرهەم دهێت ل هەموو دەڤەرا و ل هەموو دەما وەکی ئێك نینە، دەڤەرا هەی یا سارە یا هەی یا ناوەندی یە یا هەی یا گەرمە هەروەسا ب گوهۆرینا دەمی دهێتە گوهۆرین، وەکی جوداهیا دناڤ بەرا پلا گەرمێ ل هاڤین و زڤستانا و شەڤ و رۆژا، هۆیێن ڤان جوداهیان ژی دزڤرنە ڤە بۆ ڤان ئەگەرا:

### ١- گۆشا کەفتنا تیشکا رۆژێ:

مەبەست ژێ پیڤانا وێ گوشێ یە کو تیرۆژکا رۆژێ ل گەل ئەردی دروست دکەت هەتا گۆشە ستوون و نێزیکی ستوونێ بیت، دێ دەڤەر زێدەتر گەرم بیت، بەروڤاژی ڤێ هەتا گۆشە خار و نێزیکی خارێ بیت ئەو دەڤەر دێ کێمتر گەرم بیت ئەڤەژی بۆ ڤان ئەگەرا دزڤریت:

أ- تیرۆژکا ستوونی دەمەکێ کێمتر دبریت هەتا دگەهیتە سەر ئەردی ئانکو رێکەکا کێمتر دبریت رێژەکا کێمتر ژ گەرمێ بەرزە دکەت، بەروڤاژی تیرۆژکا خار کو دەمەکێ زۆرتر دبریت و گەرمەکا زۆرتر بەرزە دکەت.

ب- تیرۆژکا ستوونی لسەر رووبەرەکێ بچووك کوم دبیت و زۆرتر گەرم دکەت، بەلێ تیرۆژکا خار سەر رووبەرەکێ مەزنتر کومدبیت و کێمتر گەرم دکەت، تەماشەی وێنێ هژمارە (١٣) بکە.




وێنێ ژمارە ( ١٣ )
تیرۆژکا خار و تیرۆژکا ستوونی

## ٢- كورت و درێژیا رۆژێ:

هندی رۆژ درێژتر بیت گەرمی دێ زێدەتر هێتە بەرهەمئینان ئەڤە ل رۆژێن درێژێن هاڤینا كوردستانێ هەست پێ دهێتە كرن و درێژیا رۆژێ ل هاڤینێ ل وەلاتێ مە دگەهیتە نێزیكی (١٤) دەمژمێرا بەروڤاژی ڤێ رۆژێن زڤستانێ كو د كورتن و دگەهنە نێزیكی (١٠) دەمژمێرا ژبەر هندێ دەڤەرا مە كێمتر گەرم دبیت.

## ٣- پاقژیا هەوای:

ئەگەر هەوایێ پاقژ و بژین بیت برەكا زۆرتر یا تیرۆژكا رۆژێ دگەهیتە سەر ئەردی، ئەگەر هەوایێ پاقژ نەبوو توز و گەردیلێن رەق و شل و هەلما ئاڤێ زۆرتر تێدا بوو، ئەڤە رێ دگرن ل تیرۆژكا رۆژێ و بەرهەمئینانا گەرمێ كێم دكەن، ژ ئەنجامێ وان هۆیان یێن مە بەحس كری دیار دبیت كو دەڤەرێن سەر خرا ئەردی گەرما وان وەك ئێك نینە، د شیاندایە خرا ئەردی ژ لایێ كێمیێڤە دابەش بكەین لسەر ڤان دەڤەرێن ل خوارێ: تەماشەی وێنێ هژمارە ( ١٤ ) بكە




وێنێ ژمارە ( ١٤ )

دەڤەرێن گەرمیێ لسەر خرا ئەردی

## ١- دەڤەرا گەرم:

دکەڤیتە دناڤبەرا هەردو خولگان دا، خولگا کێڤژاله ل باکووری و خولگا کارك ل باشووری دناڤ هەردو بازنێن پانی ٢٣,٥ باکوور و باشوور و پلەیا گەرمێ ب شێوەکێ گشتی یا بلندە لڤێ دەڤەرێ ب درێژاهیا سالێ ژ بەر کو تیشکا رۆژێ ب شێوەکێ ستوونی یان نێزیکی ستوونی دکەڤیتە ڤێ دەڤەرێ.

## ٢- دو دەڤەرێن هین:

أ- دەڤەرا هینا باکوور. ب شێوەکێ گشتی دکەڤیتە دناڤبەرا خولگا کێڤژاله و بازنێ جەمسەرێ باکوور، ئانکو دناڤبەرا هەردو بازنێن پانی ٢٣,٥° - ٦٦,٥° باکوور.

ب- دەڤەرا هینا باشوور:

ب شێوەکێ گشتی دکەڤیتە دناڤبەرا خولگا کارك و بازنێ جەمسەرێ باشوور دا ئانکو دناڤبەرا هەردو بازنێن پانی ٢٣,٥° - ٦٦,٥° باشوور.

ئەگەرێ هینیا ڤان دەڤەران ژی، دزڤریتەڤە بۆ خاریا تیشکا رۆژێ.

## ٣- دو دەڤەرێن سار:

أ- دەڤەرا سارا باکوور دکەڤیتە دناڤبەرا بازنێ جەمسەرێ باکوور و جەمسەرێ باکوور دا ئانکو دناڤبەرا بازنێ پانی ٦٦,٥° - ٩٠° باکوور.

ب- دەڤەرا سارا باشوور دکەڤیتە دناڤبەرا بازنێ جەمسەرێ باشوور و جەمسەرێ باشوور دا، ئانکو دناڤبەرا هەردو بازنێن پانی ٦٦,٥° - ٩٠° باشوور.

ئەگەرێ ساریا ڤێ دەڤەرێ خاریا زۆرا تیشکا روژێ یە.

## پیڤانا پلا گەرمێ:

گەرم ب پلە دهێتە پیڤان ل وەلاتێ مە پێگیری ب پلا سەدی دهێتەکرن، پلا (سفر) پلا بەستنا ئاڤێ یە و پلا (١٠٠) پلا کەلینا ئاڤێیە، وەك دێ بێژین پلا گەرمیا دەڤەرەکێ ل دەمەکێ دیار (٣٠°) سەدییە، ئەو پلا گەرمیا هەوایە ل سیبەرێ هاتیە تۆمارکرن، لڤینا هەوای یا ئازادە و ل بلندیا ١,٥ – ٢ م تۆمار کریە.

ئەڤ ئامیرێن پلا گەرمیێ تۆمار دکەن گەلەك شێوە و جۆرێن جودا هەنە (تەماشەی وێنێن ژمارە ( ١٥ – ١٦ – ١٧) بکە.



أ– گەرمیا پیڤانا بلندترین پلە وێنێ ژمارە ( ١٥ )



ب– گەرمیا پیڤانا نزمترین پلە وێنێ ژمارە ( ١٦ )



وێنێ ژمارە ( ١٧ )

ج/ گەرمی پیڤا تومارکەر = پیرموٚگراف

## ٢- پەستانا هەوای ( فشارا هەوای ):

ئەڤ بەرگێ گازی یێ ل دوٚرمانی خرا ئەردی دزڤریت ماددەیە و ڤالاتیەك یا پرکری و سەنگ و کێش هەیە، ڤێ کێشێ دبێژنێ پەستانا هەوای، ئانکو پەستانا هەوای یا پێکهاتیە ژ گرانیا ستوونەکا هەوای ل دوماهیکا بەرگێ گازی هەتا ئاستێ روویێ دەریای، ئەڤەژی یەکسانە دگەل گرانیا ستوونەکا بلنداهیا وێ ٧٦ سم لسەر ئێك سەنتیمەترا دوجارکی.

## أ- ئەو ئەگەرێن کار ل پەستانا هەوای دکەن:

پەستانا هەوای دهێتە گوهوٚرین ژ دەڤەرەکێ بوٚ دەڤەرەکێ و ژ دەمەکی بوٚ دەمەکێ دی ئەگەرێن ڤێ گوهوٚرینێ دزڤرن بوٚ:

**١- پلا گەرمێ:** پەیوەندی دناڤبەرا پلا گەرمی و پەستانا هەوای دا پەیوەندیەکا بەروڤاژیە، ئەگەر پلا گەرما دەڤەرەکێ بلند بوو دێ پەستانا هەوای نزم بیت، ژ بەرکو هەوا زێدەتر دهێتە ژێك کێشان.

و ژێك دوور دکەڤیت و گرانیا وێ کێم دبیت. هەکە پلا گەرمێ نزم بوو دێ پەستان بلند بیت و گرانیا وێ دێ زێدەتر لێ هێت.

٢- هەلما ئاڤێ: پەیوەندی دناڤبەرا هەلما ئاڤێ و پەستانا هەوای دا دیسان بەروڤاژیە. ئانکو ئەگەر هەلما ئاڤێ ل هەوای دا زێدە بوو دێ پەستانا هەوای نزم بیت. ژبەر کو هەلما ئاڤێ سڤکترە ژ هەوای.

٣- بلندی و نزمی ژ ئاستێroوییێ دەریایێ: چەند ئاستێ روویێ دەریایێ بلند بیت پەستانا هەوای نزم دبیت، ژ بەرکو ژ لایەکی درێژیا ستوونا هەوای کورت دبیت ژ لایەکێ دیڤە چینێن سەری یێن هەوای کێشا وان کێمترە بەلێ نزمبوون ژ ئاستێ روویێ دەریایێ، پەستانا هەوای بلند دکەت، ژ بەرکو ستوونا هەوای درێژتر دبیت و گاز و پێکهاتیێن سەنگێن ل وێرێ د زێدەترن.

٤- تەوژمێ هەوای: ئانکو بزاڤا هەوایە، ئەگەر ژ خارێ بۆ سەری بوو دبێژنێ (تەوژما سەرکەفتی) ئەگەر ژ سەری بۆ خارێ بوو دبێژنێ (تەوژما داکەفتی) هەر دەڤەرەکا تەوژما هەوای داکەفتی بیت پەستانا هەوای ل وێرێ بەرز دبیت، چونکە کوم دبیت و دکەڤیتە سەر ئێك ل وێ دەڤەرێ، بەلێ هەبوونا تەوژما هەوای یا سەرکەفتی دبیتە ئەگەرا نزمبوونا پەستانا هەوای ل وێ دەڤەرێ.

## ب- دەڤەرێن پەستانا هەوای لسەر خرا ئەردی:

ژ بەر وان ئەگەرێن کو بەری نوکە مە بەحس لێ کری ئەم دشێین خرا ئەردی دابەش کەین بۆ چەند ناڤچێن پەستانی ئەوژی ئەڤەنە:

تەماشەی وێنێ ژمارە ( ١٨ ) بکە




ويێنێ ژمارە ( ١٨ )

دەڤەرێن پەستانا هەواى لسەر خرا ئەردى و ئاراستێن لڤينا باى.

## ١- دەڤەرێن پەستانا نزم ل دەوروبەرێ هێلا يەكسان:

ئەڤ دەڤەرە دكەڤيتە دناڤبەرا (هێلا يەكسانى - ٥ پلە) يا باكوور و باشوورێ هێلا يەكسانى، ئەگەرێ نزميا پەستانا ڤێ دەڤەرێ ڤەدگەريتە: بلنديا پلا گەرمێ، هەبوونا تەوژما هەوايێ سەركەفتى، زۆريا ريێژا هەلما ئاڤێ د هەوايێ دەڤەرێدا.

## ٢- دو دەڤەرێن پەستانا بەرز ل دەوروبەرێن خولگا:

ئەڤ هەردو دەڤەرە دكەڤنە دەوروبەرێ هەردو بازنێن پانێن ٣٠ باكوور و باشوورێ هێلا يەكسانى، ئەگەرێ سەرەكى يێ بلنديا پەستانى ل ڤان هەردو دەڤەرا ڤەدگەريت بۆ، هەبوونا تەوژمێ هەوايێ داكەفتى كو د بنەرەتدا ژ دەڤەرێن هێلا يەكسانى سەركەفتينە.

## ٣- دو دەڤەرێن پەستانا نیمچە نزم ل بازنێن پانێن دوور:

ئەڤ هەردو دەڤەرە دکەڤنە دەوروبەرێ بازنێ پانێ ٦٠ باکوور و باشوورێ هێلا یەکسان، ئەگەرێ سەرەکی یێ نزمیا پەستانی ل ڤان هەردو دەڤەرا دزڤریت بۆ هەبوونا تەوژما هەوایێ سەرکەفتی.

## ٤- دو دەڤەرێن پەستانا بەرز ل دەوروبەرێ جەمسەران:

ئەڤ دو دەڤەرە دکەڤنە هەردو جەمسەرێن باکوور و باشوور و ئەگەرێ بلندیا پەستانی د ڤێرێدا دزڤریتە نزمیا پلا گەرمێ، کێمبوونا رێژا شهێ، هەبوونا تەوژمێ هەوایێ داکەفتی.

## ج- پیڤانا پەستانا هەوای:

پەستانا هەوای ب (میلیبارا) دهێتە پیڤان هژمارەکا زۆرا دەزگەها یا هەی بۆ پیڤانا پەستانا هەوای، ژ وان بارۆمەترا کانزایی و بارۆمەترا جیوە و باروگراف. (تەماشەی وێنێن) ژمارە (١٩، ٢٠، ٢١) بکە.




وێنێ ژمارە (١٩)
پەستان پیڤەر (بارۆمەتر)ێ کانزایی




وێنێ ژمارە ( ٢٠ )
پەستان پیڤەرێ تۆمارکەر (باروگراف)




وێنێ ژمارە ( ٢١ )
پەستان پیڤەرێ جیوە (بارۆمەتر)

## ب- باروگراف و بەشێن وێ

## ج- بارومەترێ جیـــــوە

١- قودیکەکا کانزایی ٢- بلندکەر
٣- دەستك ٤- بوری

## ٣- بـــــا :

پێکدهێت ژ لڤینا سروشتی یا هەوای ب شێوێ ئاسویی ب ئاراستە و لڤینەکا جودا جودا ژ جهێ پەستانا بلند بۆ جهێ پەستانا نزم، لەزاتیا بای دهێتە گوهۆرین ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی و ژ دەمەکی بۆ دەمەکێ دی ژ بەر ڤان دو ئەگەرا: ئێك ژ وان جوداهیا پلا پەستانی د ناڤبەرا جهێن پەستانا بلند و جهێن پەستانا نزم دا هندی جوداهی پتر بیت، لەزاتی ژی دێ زیدەتر بیت، ئەوێن دی هێزا خشیانا بایە لسەر بلند و نزمیا روویێ ئەردی هندی خشیانا بای پتر بیت لەزاتیا بای دێ کێمتر بیت.

ڤێجا ناڤێ بای ل دویف لەزاتیا بای دهێتە گوهۆرین ئەگەر هاتنا بای هێدی بیت دبێژنێ (باهینك) ئەگەر یێ ناڤنجی بیت دبێژنێ (با) ئەگەر لەزاتیا وی گەلەك بیت دبێژنێ (باروڤە).

## أ- سالوخەتێن بای: ( صفات الرياح ):

١- با بناڤێ وی جهی دهێتە نیاسین ئەوێ ژێ دەردکەڤیت، نموونە ئەگەر با ل باکووری بەرەڤ باشووری ڤەبیت دبێژنێ بایێ باکوور.
ئەگەر ل باکوورێ رۆژهەلاتی بەرەڤ باشوورێ رۆژئاڤا ڤە چوو دبێژنێ بایێ باکوورێ رۆژهەلاتی. تەماشەی وێنێ ژمارە (٢٣) بکە.
٢- با سالوخەت و نیشانێن وی جهێ لێ دەردکەڤیت دگەل خۆڤە دگەهینیت بۆ وی جهێ دێ چیتێ و لسەررا دبۆریت، هەکە با ژ جهەکێ گەرم هات ڤێ گەرمێ دێ ڤەگوهێزیت و دبیت ببیتە ئەگەرێ داباریێ (ئەگەر ژ دەریایێ هاتبیت).
٣- با ب شێوێ ئاسۆیی ناچیت بەلکو لادانەك دکەڤیتە د چوونا ویدا ب ڤی جوری با د نیڤا خرا باکوورێ ئەردیدا دەردکەڤیت پیچەك بلا یێ رەخێ راستێ بۆ چوونا خۆ دا خاردبیت، با ل نیڤا خرا باشوورێ ئەردیدا دەردکەڤیت پیچەك بۆ لایێ چەپێ بۆ چوونا خۆ دا خاردبیت، ئەڤەژی ژ ئەگەرا جوداهیا زڤرینا بەشێن ئەردی یە لدۆر رۆژێدا. تەماشەی وێنێ ژمارە (٢٢) بکە.




وێنەی ژمارە ( ٢٢ )
لادانا بای

## ب- جۆرێن بای:

ئەم دشێین بای ل دویف دەمێ هاتنا وی دابەشکەین بۆ ڤان جۆرێن خارێ:

### ١- بایێ بەردەوام (بایێ گشتی):

وان بایا ڤەدگریت ئەوێن ب شێوێ بەردەوام دچنە سەر دەڤەرێن بەربەلاڤێن سەر خرا ئەردی، هەلکرن و رابوونا ڤان یا گرێدایە بۆ دابەشبوونا گشتی یا پەستانا هەوای لسەر خرا ئەردی ئەم دشێین ڤی جۆرێ بای دابەشکەین بۆ ڤان بەشێن خارێ.

### ١- بایێ بازرگانی:

ئەڤ بایە ل هەردو دەڤەرێن پەستانا بلند ل رەخ و دۆرێن خولگا (رەخ و دۆرێن بازنا پانی ٣٠ باکوور و باشوورێ هێلا یەکسان) دچیتە سەر دەڤەرێن پەستانا نزم ل رەخ و دۆرێن هێلا یەکسانی بۆ چوونا وی ل نیڤا خرا باکوور، باکوورێ رۆژهەلاتە و ل نیڤا خرا باشوور باشوورێ رۆژهەلاتە لەزاتیا وی ناڤنجیە و ئاراستێ وی نا هێتە گوهۆرین د زۆریا وەرزێن سالێدا یێ هەی.

### ٢- بایێن بەروڤاژی:

ل هەردو دەڤەرێن پەستانا بلند ل دەوروبەرێن خولگاندا دچنە سەر هەردو دەڤەرێن پەستانا نزما بازنا پانی (٦٠) باکوور و باشوور دبێژنێ بایێن بەروڤاژی چونکە ئاراستێ وان یێ بەروڤاژی بایێن بازرگانیە، ئانکو ل نیڤا خریا باکوور باشوورێ رۆژئاڤایە و ل نیڤا خریا باشوور باکوورێ رۆژئاڤایە.

ئەڤ بایە شهێ و گەرمێ دگەل خۆ دا دبەت بۆ سەر دەڤەرێن دێ چیتە سەر و دبیتە ئەگەرێ دابارینێ ب تایبەتی ل زڤستانێ.

## ٣- بایێ جەمسەری:

ل هەردو دەڤەرێن پەستانا بلند ل دەوروبەرێن جەمسەرا دچنە سەر هەردو دەڤەرێن پەستانا نزم ل دەوروبەرێن بازنا پانی (٦٠) باکوور و باشوور ئاراستێ وی وەکی بایێ بازرگانیە، ئانکو ل نیڤا خرا باکوور، باکوورێ رۆژهەلاتە و ل نیڤا خرا باشوور باشوورێ رۆژهەلاتە، بایەکێ گەلەکێ سارە و هشکە.

تەماشەی شێوێ ژمارە (٢٣) بکە




**شێوێ ژمارە ( ٢٣ )**

**بایێ گشتی**

## ٢- بایێ خۆجهی:

### أ- بایێ وەرزی:

ژ ئەنجامێ جوداهیا پلا گەرمێن ئاڤ و هشکاتی پەیدا دبن ب تایبەتی ل وان دەڤەرێن رووبەرەکێ هشکاتییێ مەزن و بەرفرەهـ ب رەخ رووبەرەکێ ئاڤی یێ بەرفرەهڤەهەی و ئەڤ بایە ل باشوور و باشوورێ رۆژهەلاتێ ئاسیا ب ئاشکرایی دەردکەڤن د وەرزێ هاڤینێدا رووبەرێ هشکاتیا بەرفرەهـ ژ ئەگەرێ ستوون و وەك ستوونا تیرۆژکا رۆژێ، پلا گەرمێ بلند دبیت، و دبیتە دەڤەرەکا گەرم، بەلێ رووبەرێن ئاڤێ درەنگ گەرم دبن بەرامبەری رووبەرێ هشکاتییێ ڤێجا دبنە دەڤەرێن گەرمێن ناڤنجی (ئاڤ درەنگ گەرم دبیت و درەنگ سار دبیت، بەلێ هشکاتی بەروڤاژی یە) ژ بەر ڤێ جوداهیەك دروست دبیت ل پلا پەستانا هەوای لسەر هشکاتیێ و ئاڤێ، رووبەرێن هشك دبنە دەڤەرێن پەستانا نزم ب بەروڤاژی رووبەرێن ئاڤی دبنە دەڤەرێن پەستانێ بلند، ژ بەر هندێ د هاڤینێدا بایێ وەرزی ژ ئاڤێ دچیتە سەر هشکاتییێ، ژبەر ڤێ چەندێ برەکا گەلەکا شهێ دگەل هەیە د بیتە ئەگەرا بارانبارینەکا زۆر ل هەموو دەڤەرێن ئەڤ بایە ب سەردا دبۆرن، بەلێ د زڤستانێدا تیرۆژکا رۆژێ بەروڤاژی ڤان دەڤەرا دگریت و دبیتە ئەگەرا بەردانا گەرمەکا زێدەتر ژ گەرما وەردگرن، ژ بەر ڤێ چەندێ هشکاتی زێدەتر سار دبیت ل چاڤ دەڤەرێن ئاڤێ و دبنە دەڤەرێن پەستانا بلند و رووبەرێن ئاڤی دبنە دەڤەرێن پەستانا نزم، لەوما د زڤستانێدا بایێن وەرزی ژ هشکاتییێ دچنە رووبەرێن ئاڤی، و ئەڤ بایە سار و هشك و بێ بارانن، و هەکە سەر رووبەرەکێ ئاڤێ دا چوون دێ شهێ هەلگرن و شهداربن.

بەرێ خۆ بدە نەخشێ ژمارە (٩)



بايێن وەرزێ زڤستانێ



بايێن وەرزێ هاڤينێ

نەخشێ ژمارە ( ٩ )
بايێ وەرزى ل هاڤين و زڤستانێ دا

## ب- با هينكێ دەريا و با هينكێ ئەردى:

جوداهيا پەستانى ل شەڤ و رۆژا دا دناڤبەرا ئاڤ و هشكاتييێدا دبيتە ئەگەرێ هەلكرنا بايێ ناڤچەيى و رۆژانە، كارى دكەتە سەر سەقايێ ڤان ناڤچێن نێزيكى دەريا، ئەڤەژى وەكى دياردا بايێ وەرزييە، بەلێ جوداهى دگەل ڤێ دا ئەوە، كو ئەڤە رۆژانە دووبارە دبن، بتنێ ل دەڤەرێن نێزيك دەريا، جياوازى دناڤبەرا پەستانا ئاڤێ د هشكاتييێدا ڤەدگەرييێت بۆ جوداهيێ د سروشتێ ئاڤ و هشكاتييێدا، وەكى مە بەرى نوكە بەحسكرى ژ ئەنجامێ ڤێ ب رۆژێ هەوايێ سەرهشكاتيێ ژێك دهێتە دەر و بلند دبيت بۆ سەرى و زێدەتر پەستان نزم دبيت، ڤێجا با ژ پەستانا بلندا سەر ئاڤێ دێ چيتە پەستانا نزما سەر هشكاتيێ، ئان بايێ هينێ دەريايێ ب رۆژێ ژ روبەرێ ئاڤێ دێ چيتە سەر هشكاتيێ و دێ بيتە ئەگەرێ هينكرنا هشكاتيێ ل نێزيكى دەريايێ،

بەلێ د شەڤێدا ئەڤ کریارە بەروڤاژی دبیت و هشکاتی زێدەتر ساردبیت و دبنە دەڤەرێن پەستانا بلند و رووبەرێ ئاڤێ دبیتە دەڤەرێن پەستانا نزم، و بایێ هینێ ئەردی ژ رووبەرێ هشکاتییێ دێ چیتە سەر رووبەرێ ئاڤێ، و خەلکێ باژێرێن سەر دەریایێ وەکی (بەیروت، و ئەسکەندەرییە) هەست ب ڤێ دیاردێ دکەن.
تەماشەی وێنێ ژمارە ( ٢٤ ) بکە



وێنێ ژمارە ( ٢٤ )
باهینکێ ئەردی و باهینکێ دەریایێ

## ج- باهینکێ چیا و دۆلاٚ:

ئەڤە هەر بایەکێ ناڤچەییە وەکی باهینکێ دەریا و ئەردی، بەلێ دناڤبەرا بلندیێ و نزمییێدا ئانکو دناڤبەرا چیا و دۆلاٚ دا.

ل شەڤێ ئەو بایێ لسەر دەڤەرێن بلند زێتر سار دبیت ل چاڤ وی هەوایێ دۆلاٚ دا ئەنکو پەستانا چیا بلندتر ل چاڤ پەستانا ناڤ د دولا دا، لەوما هەوا بەرەڤ دۆلێ دهێتە خار و دبێژنێ باهینکێ چیا، ئانکو باهینکێ چیا ل شەڤێ ل دەڤەرێن بلند دهێت بەرەڤ دۆلاٚ، بەلێ ل رۆژێ دا پلا گەرمێ بلند دبیت لسەر چیا ڤێ دەمی هەوا ل دۆلاٚ بەرەڤ جهێن بلند (چیا) دچیت، ئەڤێ دبێژنێ باهینکێ دۆلاٚ، ئانکو باهینکێ دۆلاٚ ب رۆژێ ل دۆلاٚ دچیت بۆ دەڤەرێن بلند (چیا).

## پیڤانا بای:

١- پیڤانا سەنتا بای. ب هاریکاریا دەزگەهەکی دهێتە پیڤان دبێژنێ (باگێر). تەماشەی وێنێ هژمارە (٢٥) بکە.

٢- پیڤانا لەزاتیا بای. ب هاریکاریا دەزگەهەکی دهێتە پیڤان دبێژنێ (لەزاتی پیڤ) (ئەنیمومەتر). تەماشەی وێنێ ژمارە (٢٦) بکە.




وێنیٚ ژمارە ( ٢٥ )

پیڤەریٚ سەنتا بای (باگێر)



وێنیٚ ژمارە ( ٢٦ )

پیڤەریٚ لەزاتیا بای (ئەنیمومەتر)

## ٤- شه و داباراین:

مەبەست ژ شهێ ل ناڤ بەرگێ گازی، ئەو برا ئاڤێ یە ئەوا ل ناڤ بەرگێ گازیدا هەی ئەڤجا ب هەر شێوەکی بیت، هەلما ئاڤێ – شل – رەق.

مەبەست ژ داباریـنێ هاتنا خوارێ یا وێ برا هەلما ئاڤێ یە ئەوا خەست بووی ئەڤجا ب شێوێ باران – یـان گژلوك یـان بەفر بیت.

بەلێ باران ئەو دلۆپا ئاڤێ یە ئەوا کێشا وێ یا گرانە ئێدی هەوا نەشێت هەلگریـت و دکەڤیتە سەر ئەردی.

## أ- مەرجێن خەست بوون و داباریـنێ:

هەکو هەلما ئاڤێ خەست دبیت ئانکو ژ بارێ گازی دهێتە گوهۆریـن بۆ بارێ شلی یـان رەقی. ئەڤ شێوێن خوارێ ڤەدگریـت. عەور (ئەور) – مژ – خیسار – خۆناڤ... هتد

هەتا کریـارا خەست بوونێ رووبدەت دڤێت ئەڤ مەرجێن ل خوارێ هەبن:

١– هەبوونا برەکا باش یـا هەلما ئاڤێ د هەوایـدا

٢– نزمبوونا پلا گەرما هەوای تا رادا چربوونێ

٣– هەبوونا هندەك گەردیلێن رەق دا هەلما ئاڤێ لدۆر خەست ببیت

هەکو ئەڤ مەرجە پەیـدا بوون دێ خەست بوون پەیـدا بیت و عەور دێ دروست بن، بەلێ دلۆپکێن ئاڤێ ئان پەرمیـچکێن بەفرێ هێشتا د سڤکن و هەوا دشێت هەلگریـت، پێدڤیە کریـارەکا دی ببیت هەتا دلۆپکێن ئاڤێ و پەرمیـچکێن بەفرێ بکەڤنە سەر روویێ ئەردی و ژ ئەنجامێ ڤێ کریـارێ قەبارە و سەنگا دلوپکێن ئاڤێ و پەرمیـچکا مەزنتر و گرانتر دبیت هەتا رادێ هەوا نەشێت هەلگریـت، دێ کەڤنە سەر روویێ ئەردی ئەڤ کریـارەژی مەزنبوونە ب هەر رێکا هەبیت ،

هەکو مەزن بوو دێ گران بیت هەوا نەشێت هەلگریت و دێ کەڤیتە ئەردی.

## ب- جۆرێن بارانێ:

ل دویڤ وان رێکێن پلا گەرما هەوای شهداری پێ نزم دبیت و باران دابەش دبیت بۆ ڤان جۆرا:

### ١- بارانا بلند رێ: (التصاعدیة):

ئەو بارانە ئەوا ل دەڤەرێن گەرم دباریت، ب تایبەت ل دەڤەرێن کەمەری. ئەگەرێ بارینا ڤی جۆرێ بارانێ ڤەدگەریێت بۆ ڤان تەوژمێن هەوایێ بلند دبن بۆ سەری، بلند بوونا هەوایێ شهدار پلا گەرما وێ دهێتە خوار هەتا پلا خەست بوونێ، پشتی هینگێ عەور لێ درست دبن و بارانەکا تۆند و بهێز دێ باریت. تەماشەی وێنێ ژمارە (٢٧) بکە




وێنێ ژمارە ( ٢٧ )
بارانا بلند رێ

## ٢- بارانێن بلندە هەرێم: (التضاريسية):

ئەو بایێ ژ دەریا و زەریا دهێن برەکا زۆرا هەلما ئاڤێ هەلدگرن، ل دەمێ دگەهتە بلندیێن دەڤەرێن چیایی دێ ناچار بیت بلند بیت، بڤێ چەندێ پلا گەرمێ دێ هێتە خوار ل دویڤ دا هەلما ئاڤێ دێ خەستبیت و دێ بیتە داباریں د بەر گوبك و رەخ و روویێن چیا دا دێ باریت، رەخێ بەرامبەر بای بارین زێدەترە ژ بارانا لایێ نەبەرامبەر و دبێژنێ رەخێ سیبەرا بارانێ، ژ بەرکو رەخێ سیبەرا بارانێ بایێ شهدار دهێتە خوارێ، بڤێ چەندێ پلا گەرما وێ بلند دبیت و خەستبوون کێمترە و دێ بیتە ئەگەرا کێم بارانێ، ئەڤ جۆرێ بارانێ ل دەڤەرێن چیایی یا زۆرە وەکی وەلاتێ مە. تەماشەی وێنێ ژمارە (٢٨) بکە.




وێنێ ژمارە ( ٢٨ )
بارانێن بلندە هەرێم

## ٣- بارانێن بارۆڤە: (الاعصارية):

ئەڤ بارانە ژ بارۆڤێ پەیدا دبیت، ب تایبەت ئەوێن بایێ رۆژئاڤا دئینیت (وەکی بەشەکێ بارانا هەرێما کوردستانێ)، ئەڤ جورە ژ ڤێك گەهشتنا وان بارستێن ڤی بای پەیدا دبیت ئەوێن د خاسیەتا دا ژ هەڤ د جودان، ئێك یێ گەرم و شهدارە یێ دی یێ سار و هشکە، ژ بەر هندێ یێ گەرم و شهدار دێ بلند بیت بۆ سەری ژ بەر کو سڤکترە، ب بلند بوونا وی پلا گەرما وێ دێ نزمبیت و ل دویڤدا خەستبوون دێ پەیدابیت و دابارین دێ دەست پێکەت.

تەماشەی وێنێ ژمارە (٢٩) بکە.




وێنێ ژمارە ( ٢٩ )
بارانێن بارۆڤە

## ج- پیڤانا دابارینێ:

داباریـن ب هەر شێوەکی بیت (باران، بەفر، گژلوك) هەر ب شێوازێ شلی رەفتار د گەلدا دهێتە کرن دێ بێژنێ هندە میللیمەتر و هندە سانتیـمەتر یـێن باریـن، ئەڤەژی ب گەلەك رێك و دەزگەهێن جودا جودا دهێنە پیڤان و ژ هەمووا ساناهی تر پیڤەرێ بارانێ یە، تەماشەی وێنێ ژمارە (٣٠) بکە



وێنێ ژمارە ( ٣٠ )

(باران پیڤەر) نیشا ددەت

# زاراڤ

| | |
|---|---|
| ١- بەرگێ رەق (بەرگێ بەری) | Lithosphere |
| ٢- بەرگێ ئاڤێ | Drosphere |
| ٣- بەرگێ گازێ | Atmosphere |
| ٤- بەرگێ زیندی | Biosphere |
| ٥- دول | Valley |
| ٦- بانی | Paltean |
| ٧- گر | Hill |
| ٨- چیا | Mountain |
| ٩- دەشت | Plain |
| ١٠- بلند و نزمیا روییێ ئەردی | Relief |
| ١١- سەقا | Weather |
| ١٢- ئاڤ و هەوا | Climate |
| ١٣- پلا گەرمی | Temperature |
| ١٤- پەستانا هەوای (فشارا هەوای) | Pressure |
| ١٥- شەهـ (شێ) | Humidity |
| ١٦- داباریـن | Precipitation |
| ١٧- هەلما ئاڤێ | Water Vapour |
| ١٨- ئەور | Cloud |
| ١٩- مژ | Fog |
| ٢٠- خوناڤ | Dew |
| ٢١- خیسار | Frost |
| ٢٢- بارستێ بای | AirMass |
| ٢٣- بارۆڤە | Cylone |
| ٢٤- باران | Rain |
| ٢٥- گژلوك | Hail |
| ٢٦- با | Wind |

## پسیاریٚت پشکا سێ

پ١/ راست و خەلەتیێن ئەڤێن خوارێ دیاربکە و خەلەتیا دروست کە:

١- بتنێ بەرگێ ئاڤێ بەرگێ زیندی پێك دئینیت.

٢- دەریایێن دەرەکی دکەڤنە ناڤ کێشوەرا دا د دەربەندەکێ تەنگدا دگەهنە زەریا.

٣- هندی پلا گەرمێ بلند بیت پەستانا هەوای ژی دێ بلند بیت.

٤- با بناڤێ وی جهی دهێتە نیاسین ئەوێ ژێ دهێت.

٥- پتریا بارانێن کوردستانێ ژ جۆرێ بارانا بلندە هەرێمن.

٦- رەخێ سیبەر باران پتر لێ دبارن ژ لایێ بەرامبەری بای.

٧- هندی هەوایێ پاقژ و بژین بیت تیرۆشکا رۆژێ پتر دێ گەهیت.

پ٢/ ڤان ڤالایێن ل خوارێ ب پەیڤەکا راست پربکە:

١- ئەرد ژ سێ بەرگا پێکدهێت ئەوژی ئەڤەنە أ- ----------------

ب- ---------------- ج- ---------------- ژ تێکەلبوونا

ڤان سێ بەرگا دێ بەرگەکێ دی درست بیت ئەوژی ----------------

یە.

٢- مەزنترین زەریا ---------------- و بچووکترین ژی ----------------.

٣- بایێن وەرزی ل زڤستانێ ژ ---------------- دچنە بۆ ----------------.

٤- مەرجێن خەستبوونا هەلما ئاڤێ پێکدهێن ژ أ- ----------------

ب- ---------------- ج- ----------------.

٥- ژ جوداهیێن مەزن دناڤبەرا بایێن وەرزی و باهینکێ دەریا و باهینکێ هشکاتی

أ- ---------------- ب- ----------------

پ٣/ بەرسڤێن راست بۆ ڤان پسیارێن ل خوارێ هەلبژێره:

١- بانیا (دکن، تبت، نەجد) بەرفرەهترین بانیەنە د جیهانێدا.

٢- دەریا (چین، قەزوین، ناڤەراست) ژ هەموو لاڤە ب هشکاتی دۆرپێچکریە ناگەهتە دەریا.

٣- لەزاتیا بای ب دەزگەهەکی دهێتە پێڤان دبێژنێ (ئەنیمومەتر، باگێر).

٤- (پلا گەرمێ، پەستانا هەوای، داباریں) بگرنگترین رەگەزێن ئاڤ و هەوای دهێتە هژمارتن.

٥- هەر دەڤەرەکا تەوژمێن هەوایێ داکەفتی هەبن پەستانا وێ (بلندە، نزمە، ناڤنجیە).

پ٤/ ئەگەرێ ڤان دیاردێن ل خوارێ دیار بکە:

١- تیرۆشکا ستوونی دەڤەرێ پتر گەرم دکەت ژ تیرۆژکێن خار.

٢- نزمیا پەستانا هەوای ل دەڤەرێن رەخ و روویێن هێلا یەکسانی.

٣- هندی ژ ئاستێ روویێ دەریا بلند بین بۆ سەری پلا گەرمێ دێ هێتە خار.

٤- هندی هەلما ئاڤێ ل ناف هەوایدا پتربیت پەستانان نزمترە.

پ٥/ جوداهی چنه دناڤبەرا:

١- سەقا و ئاڤ و هەوا.

٢- دەریا و زەریا.

٣- بایێ گشتی و بایێ خوٚجهی.

پ٦/ بەحسێ دەڤەرێن پەستانا هەوای لسەر خرا ئەردی بکە پاشی وێنەکێ روٚنکەر بوٚ بکێشە.

**چالاکی:**

هەکە تە شیان هەبن سەرەدانا نێزیکترین ویستگەهێن سەقا ناسیێ بکە ل دەڤەرێن تە بوٚ هندێ دا ژ نێزیک شارەزاییێ دەزگەهێ پیڤانێ بی.

# پشکا چارێ
# ئاکنجی (دانیشتوان)

## ئاکنجی:

ڤەکۆلینێن ئاکنجییێ پیتە و گرنگیا هەی، چونکە زێدەرێ هەموو دیاردێن کۆمەلایەتی، دیموگرافی[1]، ئابووری، رامیارینە، ژ بەر ڤێ چەندێ ژ کەڤن وەرە زانا و شارەزا و رێکخراوێن نێڤ دەولەتی و دەولەتان ڤەکۆلین و بەلاڤوکێن بەردەوام ئەنجامداینە.

ئاکنجێن جیهانێ پشتی شەرێ جیهانییێ دووێ ب شێوەیەکێ ئاشکرا ژمارا وان بەرەف زێدەبوونێ چوو، ئەڤ راستییە لسەر هژمێریا ئاکنجیان و ئامارا کو د وەلاتێن جیهانێدا هاتیە کرن دیاربوو.

گرنگیا سەر هژمێریا و ئامارا دووێ دایە، بارودوخێ ئاکنجیان پێشکەفتن و پێکهاتن و گوهۆرینێن دیموگرافی و کۆمەلایەتی و ئابووری دیار دکەن، ژ بەر ڤێ چەندێ دەولەتێن پێشکەفتی هەول ددەن پلانێن زانستی و رامیاریێن گونجای دانن بۆ ئاکنجیان دا کو هەڤسەنگییێ بکەن و توخیبەکی دانن بۆ زێدەبوونا ئاکنجیان لگەل دەرامەتێ سروشتی و مرۆڤی کو بدەستڤەدهێت، و زێدەتر بکەن و شێوازێن بەرهەمی ژ لایێ جۆر و قەبارەی ڤە بهێنە گوهۆرین، داکو پێشڤەبرن و بلندکرنا ئاستێ ژین و ژیارا ئاکنجیان باشتر بیت و پێکول بهێتە کرن بۆ چارەسەریا هەموو ئاریشە و گرفتارییان

---

(١) دیموگرافیا: زانستێ ڤەکۆلینێن ئاکنجیانە ژ لایێ چەندایەتییێ، ئەڤەژی ب رێکا ئامارێن زیندەیی وەکی (ژدایکبوون، مرن، مشەختبوون) ژ ئەگەرێن کێم و زێدەبوونا ئاکنجیان، ئەنجامێ وان گوهۆرینا دەردئێخیت.

ئاكنجيان ژ لايێ رامياريا دەولەتا و ئابووری و كۆمەلايەتی و خۆجهی و كێم دەرامەتی و هەژاری د جیهانێ دا ب پلانەكا زانستی پێنگاڤ بۆ بهێتە هاڤێتن.

## ژێدەرێن ڤەكولینێن ئاكنجیان:

### أ- سەرهژمێریكرنا گشتی یا ئاكنجیان (التعداد العام للسكان):

سەرژمێریا گشتی پێكهاتیە ژ پروسا كۆمكرن و ئامادەكرن و شلۆڤەكرن و هەلسەنگاندن و بەلاڤكرنا زانیاریێن دیموگرافی و كومەلایەتی و ئابووری دەربارەی خەلكێ وەلاتەكی یان دەڤەرەكا دیاركری ل دەمەكێ دیاركری.

## تایبەتمەندییێن سەرهژمێریكرنا ئاكنجیان:

تایبەتمەندییێن سەرهژمێریكرنا ئاكنجیان:

١- تۆماركرنا زانیارییێن ئامارا ناڤڤیسینێ بۆ هەموو كەسان بێ جوداهی هەتا بیانییێن ل ناڤ وەلاتی ژی ڤەدگریت.

٢- سەرژمێری دەڤەرەكا جوگرافی یا دیاركری ڤەدگریت.

٣- دەمەكێ دیاركری بۆ سەرژمێریێ دێ هێتە دانان ب شێوێ خولەكی (٥ - ١٠) سالا جارەكێ بیت.

## گرنگیا سەرهژمێریا ئاكنجیان:

١- زانینا پێزانینا دەربارەی هژمارا ئاكنجیان و دابەشبوونا وان ل دەڤەرەكا دیاركری.

٢- زانینا پێزانینا دەربارەی پێشڤەبرن و گوهۆرینێن بەردەوامێن ئاكنجیان وەكی (ژدایكبوون، مرن، مشەختبوون، بارێ خێزانی، بەردان، ... هتد)

### ب- ئامارا ئاكنجییان (الاحصاء السكانی):

پێك دهێت ژ ڤەكۆلینەكا زانستی دەربارەی ژمارا ئاكنجیان ژ لایێ تایبەتمەندی و چالاكیێن گوهۆرینا كۆمەلێ وەكی ژدایكبوون، مرن، مشەختبوون، ژن ئینان، جودابوون، ...هتد.

## جوداهی دناڤبەرا سەرهژمێریكرنێ و ئامارا ئاكنجیان دا :

١- سەرهژمێریا ئاكنجیان تایبەتمەندیا كەسا ڤەدگریت ب گشتی ل وەلاتی بەلێ ئامارێن ئاكنجیان گوهۆرینا دیموگرافی دەردئێخیت.
٢- سەرژمێریاری ب شێوێ خۆلیە، بەلێ ئامارا ئاكنجیان سالانەیە.
٣- سەرژمێریكرنا ئاكنجیان ل مێژوویەكا كەڤن یا هاتیە بكارئینان بەلێ ئامارا ئاكنجیان یا نوویە.

## وەرار و زۆربوونا ئاكنجیان :

وەرار: پێكهاتیە ژ زۆربوونا ئاكنجیان دناڤبەرا دو سەرهژمێرێن هاتینە كرن و زانین دەردكەڤیت و ئەڤەژی ژ ئەنجامێ جوداهیا دناڤبەرا هژمارا ژ دایكبوویا و هژمارا مریا ومشەختبوویا پەیدا دبیت... وەرار دوو جۆرە:

### أ- زێدەبوونا سروشتی :

پێكهاتیە ژ جوداهیا دناڤبەرا ژمارا ژ دایكبوونێ لگەل ژمارا مریا ل دەمەكێ دیاركری و ل دەڤەرەكا دیاركری.
زێدەبوونا سروشتی پێكهاتیە ژ (ژمارا ژدایكبوونێ - ژمارا مرنێ) زێدەبوونا سروشتی یا سالانە ل وەلاتێن جیهانی بەرەڤ زێدەبوونێ یە ب تایبەت ل وەلاتێن تازە پێگەهشتی ل كێشوەرێن ئاسیا، ئەفریقیا، ئەمریكا لاتینی وەكی وەلاتێن (هندستان - بەنگەلادیش) بەلێ ل

وەلاتێن پێشکەفتی پیشەسازی وەك رۆژئاڤاییێ ئەورووپا و وەلاتێ ئێککگرتی زۆر نینە ژ ئەگەرێ دیارکرنا (وەچە) ئانکو دانانا رادەکی بۆ زارۆك بوونێ.

## ب- زێدەبوونا نەسروشتی:

ئەڤ جۆرێ زێدەبوونێ ژ ئەنجامێ جوداهییێ دناڤبەرا ژ دایکبوون و مرنێ پەیدا نابیت. بەلکو ژ ئەگەرێ مشەختبوونێ بۆ دەرڤەی وەلاتێ دایك مشەختبوونا (لوبنانیا) بۆ کێشوەرێ ئەورووپا و مشەختبوونا میسرییا بۆ دەرڤە یان ژ ئەگەرێ داگیرکرنا لەشکەری یان کویلایەتی (عەبدایەتی) دبیت وەك مشەختبوونا جەزائیریا بۆ فەرەنسا و ئەورووپا بۆ هەردو ئەمریکا باکوور و باشوور.

## دابەشبوونا ئاکنجیان:

ئاکنجیێن جیهانێ لسەر رووبەرێ ئەردیدا ب جۆرەکێ یەکسان دابەش نابن، ژ بەر وێ نێزیکی (٥٠٪) ئاکنجیێن جیهانی لسەر رووبەرەکی دژین کو ژ (٥٪) سەرجەم رووبەرێ هشکاتی نابووریت.
ئەڤەژی وێ دگەهینیت کو هشکاتییا خرا ئەردی ژ چەند بەشا یا ئاڤەدانە و بەشێن دی چۆلە یان وەکی چۆلیە.
ئاڤەدانی ئەو دەڤەرەنە کو مرۆڤ تێدا خۆ جهن، هەرچەند شێوازێ دابەشبوونا وان وەك ئێك نینن ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی. دەڤەرێن چۆل یان کێم ئاکنجی ئەو دەڤەرن کو ب ئەگەرێ گەلەك نزمیا پلا گەرمێ تێدا وەك دەڤەرێن هەردو جەمسەرێن باکوور و باشووری، یان ژ ئەگەرێ بلندیا پلا گەرمی و هینکیا ئاڤ و هەوای وەك بیابانێن گەرم ل ناڤەراستا ئاسیا و باکوورێ ئەفریقیا و هەرێمێن دارستانا هێلا یەکسانی ل ئاڤژێرا ئەمەزون و کونگۆ. کیشوەرێن جیهانا کەڤن

(ئاسیا – ئەوروپا – ئەفریقیا) زێدەترین ژمارا ئاکنجیان تێدا خۆجهن دگەهنە (٨٥٪) ئاکنجیێن جیهانی و (١٥٪) تەڤ ئاکنجیێن مایی دکەڤنە کیشوەرێن جیهانا نوو (ئەمریکا باکوور – ئەمریکا باشوور – ئوستڕالیا) ئانکو زوربەیا ئاکنجیان دکەڤنە نیڤا خرا باکوور یا ئەردی، ژبەر زۆربەیا هشکاتیێ ل نیڤا باکووریدایە و نیڤا باشوورێ ئەردی هشکاتی کێمترە. تەماشەی خشتێ ژمارە (٣) بکە.

| سال | ئەفریقیا | ئاسیا بە بێ یەکیەتی سۆڤیەت | ئەورووپاو یەکیتی سۆڤیەت | ئەمریکای باکوور | ئەمریکای باشوور | ئوستڕالیا و نیوزلەندا | جیهان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٦٥٠ | ١٠٠ | ٣٢٧ | ١٠٣ | ١ | ١٢ | ٢ | ٥٤٥ |
| ١٧٥٠ | ٩٥ | ٤٧٥ | ١٤٤ | ١ | ١١ | ٢ | ٧٢٨ |
| ١٨٥٠ | ٩٥ | ٧٤١ | ٢٧٤ | ٢٦ | ٣٣ | ٢ | ١١٧١ |
| ١٩٥٠ | ٢٢٤ | ١٣٧٦ | ٥٧٢ | ١٦٦ | ١٦٥ | ١٣ | ٢٥١٦ |
| ١٩٧٥ | ٤١٣ | ٢٣٥٤ | ٧٢٧ | ٢٣٩ | ٣٢١ | ٢١ | ٤٠٧٥ |
| ١٩٨٥ | ٥٥٥ | ٢٨١٨ | ٧٧١ | ٢٦٤ | ٤٠٥ | ٢٥ | ٤٨٣٨ |

خشتێ ژمارە ( ٣ )
ژمارا دابەشبوونا ئاکنجیان لدویڤ کێشوەران

## چڕی و پڕیا ئاکنجیان:

پێکهاتیە ژ دابەشبوونا ژمارا ئاکنجیان سەر یەکەیەکا پیڤەریێدا یان هژمارەکە کو پێکدهێت ژ ئەنجامێ دابەشکرنا ژمارا ئاکنجیان د دەڤەرەکێدا لسەر رووبەرێ ئەوێ دەڤەرا لسەر دژین، چڕی و پڕیا ئاکنجیان ل دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی و ل کێشوەرەکی بۆ کێشوەرەکێ دی ژێك جودایە، ژ ئەگەرێ جوداهیا بارێ سروشتی و جوگرافی وچالاکیێن مرۆڤی وەکی (ئابووری، شارستانی، کومەلایەتی، رامیاری).

تەماشەی خشتێ ژمارە (٤) بکە چڕی و پڕیا ئاکنجیان ل کێشوەرێن جیهانێ دیاردکەت.

| کیشوەر | چڕی کەس/کم$^{٢}$ | کیشوەر یان ناوچە | چڕەی کەس/کم$^{٢}$ |
|---|---|---|---|
| ئەفریقیا | ١٦ | ئوستراليا | ٣ |
| ئەمەریکای باکوور | ١٢ | جیهان بە گشتی | ٣٥ |
| ئەمەریکای باشوور | ١٩ | | |
| ئاسیا | ٩٧ | عێراق | ٣٨ |
| ئەورووپا | ٩٩ | هەرێمی کوردستانی عێراق | ٣٦ |

خشتێ ژمارە ( ٤ )

چڕ و پڕیا ئاکنجیان ل جیهانێ

## جۆرێن چڕیێ:

چڕی و پریا ئاكنجیان ل دەڤەرەكێ بۆ دەڤەرەكا دی دهێتە گوهۆرین، هەتا ل ناڤ كێشوەرەكی دا وەكو ئێك نینە، چڕی بۆ ڤان بەشا دهێتە دابەشكرن:

١- چڕی و پریا گشتی: پێكهاتیە ژ دابەشكرنا هژمارا ئاكنجیێن وەلاتەكی یان دەڤەرەكێ ب گشتی ب سەر رووبەرێ گشتی یێ وەلاتی یان دەڤەرەكێ ب گشتی ب سەر رووبەرێ گشتی یێ وەلاتی یان دەڤەرێ دا.

٢- چڕیا كشتوكالی: پێكهاتیە ژ دابەشكرنا ژمارا ئاكنجیێن دەڤەرەكێ یان وەلاتەكی ب سەر رووبەرێ گشتی یێ كشتوكالی دا.

٣- چڕیا ئابووری: ئەڤ جۆرێ چڕیێ ژ جۆرێن دی گونجایتره بۆ زانینا بارێ ئابووری و كارێن مرۆڤ دكەت ب شێوەكێ رۆنتر كێم و زۆریا چڕیێ دیاردكەت.

ئاكنجیێن جیهانێ لدویڤ چڕیێ لسەر سێ دەڤەرا دهێنە دابەشكرن ئەوژی ئەڤەنە:

### ١- دەڤەرێن گەلەك چڕ:

چڕیا ئاكنجیان د ڤێ دەڤەرێدا زێدەترە ژ (١٠٠ كەسان/كم٢) وەكو دەڤەرێن باشوورێ رۆژهەلاتێ ئاسیا، ناڤەراست و رۆژئاڤایا ئەورووپا ئەڤەژی ژ ئەگەرێ زۆریا چالاكیێن كشتوكالی و پیشەسازی و چالاكیێن دی د ڤان دەڤەرادا.

### ٢- دەڤەرێن چڕیا ناڤنجی:

وان دەڤەرێن جیهانێ ڤەدگریت كو چڕی و پریا وان ژ (١ - ١٠٠ كەسایە/ كم٢) وەكی (ئوسترالیا، كوردستان، نیشتیمانێ عەرەبا).

### ٣- دەڤەرێن كێم چرِی:

وان دەڤەرا ڤەدگریت کو چریا ئاكنجیان تێدا گەلەك كێمە و كێمترە ژ ئێك كەس لسەر کیلومەترەکا چوار گۆشە، ژبەر سەختیا بارودۆخێ ئاكنجیبوونێ ل وان دەڤەرا ژ بەر ڤان ئەگەرا:

أ- دەڤەرێن بیابانێن هشك و بێ ئاڤ و گەرم وەكی بیابانا نیمچە دورگا عەرەب و بیابانا مەزنا ئەفریقیا.

ب- دەڤەرێن گەلەك سارێن هەردو جەمسەرێن باكوور و باشوورێ ئەردی.

ج- دەڤەرێن چیایێن بلند وەكو هیمالایا ل ئاسیا و ئەندێز ل ئەمریكا باشوور.

د- دەڤەرێن گەلەك گەرم و شهدار وەكو ل دارستانێن ئەفریقی و رووبارێ ئەمەزون و كونگۆ.

## ئەو ئەگەرێن كار دكەنەسەر بەلاڤبوونا ئاكنجییا:

بەری نوكە مە دیاركربوو كو بەلاڤبوونا ئاكنجیان د جیهانێدا نە وەك ئێكە بەلكو یا جودایە ئەڤ جودایە ژ ئەنجامێ كارتێكرنا ئەگەرێن سروشتی و مرۆڤی پەیدابووینە ئەم دشێین ڤان ئەگەرا ب ڤی شێوێ ل خوارێ دەست نیشان بكەین:

### ئێك: ئەگەرێن سروشتی:

#### ١- ئاڤ و هەوا:

رەگەزێن ئاڤ و هەوا ب شێوێ ئێكسەر یان نە ئێكسەر كاردكەنە سەر بەلاڤبوونا ئاكنجیان ل دەڤەرێن جودا جودا یێن جیهانێ.

بلندیا پلا گەرمێ كاردكەتە سەر زور كێمیا ئاكنجیان. بۆ نموونە ل بیابانا مەزنا ئەفریقیا پلا گەرمێ ل وەرزێ هاڤینێ دگەهیتە نێزیكی

٥٠ ژ سەدێ یان بەروڤاژی ڤێ نزمبوونا پلا گەرمی کاری ل کێمبوونا ئاکنجیان دکەت.

وەکی دەڤەرێن سیبیریا ل ئاسیا و باکورێ کەنەدا ل زڤستانێ پلا گەرمێ نزم دبیت هەتا چەند پلەکا لبن سفر سەدیدا.

هەر وەسا بارانبارین ژ لایێ زۆر و کێمیێ کاری لسەر بەلاڤبوونا ئاکنجیان دکەن وەکی گەلەك باران بارین ل دەڤەرێن هێلا یەکسانی ل ئاڤریێژا رووبارێ ئەمەزون و کونگۆ پلا گەرمێ و رادێ شهێ و باران زۆر چالاکیێن مرۆڤی کێم دکەن، دەڤەرێن کێم باران وەکی بیابانێن گەرم و هشك ل ئەفریقیا و ناڤەراستا ئوسترالیا ئاکنجیبوون یا کێمە.

## ٢- بلند و نزمیا روویێ ئەردی:

جوداهی و نە وەکهەڤیا بلند و نزمیا روویێ ئەردی ل دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی و ل کیشوەرەکی بۆ کێشوەرەکێ دی بوویە ئەگەرا جوداهیا بەلاڤبوونا ئاکنجیان، بۆ نموونە ل دەشتا ژ بەر سانەهیا هاتن و چوونێ و چالاکیێن مرۆڤی بوونە مەلبەندێ کومبونا ئاکنجیان وەکی دەشتا لیتەیی ل عیراقێ و دەشتا هەڤلێر و شارەزور و بێتوێن.

بلندیا چیا ئەگەرەکا دیە ژبۆ کێمکرنا ئاکنجیبوونێ ژبەر ئاسێتیا ئەردی وەکی چیایێن هیمالایا ل ئاسیا و چیایێ ئەندیز ل ئەمریکا باشوور و چیایێ حەساروست ل هەرێما کوردستانا عیراقێ.

### ٣- جۆرێ ئاخێ:

جۆرێ ئاخێ کار دکەتە سەر بەلاڤبوونا ئاکنجیان ژ لایێ گرنگیا ئابووری و بەرهەمێن کشتوکالیڤە. لدویڤ هندێ ئاکنجیێن دەڤەرێن ئاڤەکا ب زاخ چریا ئاکنجیبوویان یا زۆرە، وەکی ئاڤا دەشتا سەند و کەنج و دەشتا شارەزور و پشدەرێ یان ئاخا دەڤەرێن گرکانە وەك گزیرتێن چاوە و یابان بەلێ ل ئاخەکا بێ زاخ ئاکنجیبوون یا کێمە.

### ٤- ژێدەرێن ئاڤێ:

کومبوونا ئاکنجیان و زوربوونا وان یا ب ژێدەرێن ئاڤێ ڤە گرێدایە، وەکی رووبارا، دەریایێن بچووك، بیر و کانیا یان ئاڤا ژێرئەردی.

ژبەر کو ڤان ژێدەرا مفایێ بۆ کارێ کشتوکالی و گیانداری و پیشەسازی و چالاکیێن دی ژی هەی، ئانکو ئەو دەڤەرێن ژێدەرێن ئاڤێ لێ د زۆربن دێ ئاکنجیبوون ژی لێ زۆر بیت ب بەروڤاژی دەڤەرێن بیابانێ ئاکنجیبوون یا کێمە.

### ٥- سامانێ کانزا:

سامانێ کانزا رولێ هەی لسەر بەلاڤبوون و کێمکرنا ئاکنجیان ئەڤەژی بۆ دەرهێنانا کانزا و کارکرن ل کارگەهان، کانزا وەك ئاسن و سفر و فوسفات و گوگرد یان ژێدەرێن وزەی وەکی نەفتێ کو دبنە ئەگەرێ کومکرنا ئاکنجیان ل وەلاتێ عەرەبی دا کو ل گەلەك جهێن بیابانان دهێنە دەرئێخستن و سافیکرن یان رەژیا بەری ل چیایێت ئورال ل ئەورووپا یان ئاسن ل دەڤەرێت سار ل سوید و نەرویج یان سفر ل شیلی و پیرو ل چیایێن ئەندیز هەبوونا ڤی سامانی دبنە ئەگەرێ کۆمکرنا ئاکنجیان ل جهێن کاری و بەرهەمی.

## ٢- ئەگەرێن مرۆڤی:

### ١- تێکرایێ ژ دایکبوونێ و مرنێ:

تێکرایا وەرارا ئاکنجیان ل دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی وەك ئێك نینە، ئەڤەژی ل تێکرایێن ژدایکبوونێ و مرنێ دەردکەڤیت و ئەڤ جوداهیە کار دکەتە سەر زۆری و کێمیا ئاکنجیان ل ئاستێ وەلاتان یان دەڤەرێن جیهانێ. هەتا رادەکی بارێ رەوشەنبیری و شارستانی سنووری بۆ زۆربوونا ئاکنجیان د دانیت هەروەسا ژی یان درەنگ پێکئینانا خێزانێ و ئەگەرێن ئایینی کارێ کریە سەر تێکرایا زێدەبوونێ.

بۆ نموونە بلندیا رێژا ژدایکبوونێ ل باشوورێ رۆژهەلاتێ ئاسیا کار ل زۆربوونا ئاکنجیان کریە، بەلێ بلندیا رێژا مرنێ ل دەڤەرێن هندستان و ئەفریقیا و ئەمریکا لاتین تا رادەکی بلندترە ل چاڤ دەڤەرێن دی ل جیهانێ.

### ٢- مشەختبوون:

پێکهاتیە ژ چوونا ئاکنجیان ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی ب مەرەما گوهۆرینا جهێ ئاکنجیبوونا خۆ ل دەمەکێ دیارکری،

مشەختبوون دو جۆرن:

### أ- مشەختبوونا دەرڤە:

ئەڤ جۆرێ مشەختبوونێ چوونا ئاکنجیان تێدا سنوورێ وەلاتی دبرن و دچنە وەلاتەکێ دی، مشەختبوونا دەرڤە ل وەلاتەکی بۆ وەلاتەکێ دی یان ژ کیشوەرەکی بۆ کیشوەرەکێ دی جوداهیەك هەیە ژ ئەگەرێ بارێ رامیاری و ئابووری و ب جوداهیا گەلان و مللەتان، ئەڤ مشەختبوونە دهێتە گوهۆرین و هژمارا زۆری و کێمیێ وەك

عیراقیا بۆ دەرڤە یان ئەفریقیا بۆ ئەورووپا و ئەمریکا باکوور و مشەختبوونا کوردا بۆ کیشوەرێن ئەورووپا و ئەمریکا باکوور و ئوستورالیا.

### ب- مشەختبوونا ناڤخۆ:

هاتن وچوونا ئاکنجیان ل ناڤ وەلاتی دا ژ باژێرەکی بۆ باژێرەکێ دی رووددەت یان ژ گوندا بۆ باژێران.
ئەڤ مشەختبوونە ژ ئەگەرێ چالاکیێن ئابووری، کۆمەلایەتی رووددەت، وەکو مشەختبوونا ئاکنجیێن وەلاتێن تازە پێشکەفتی ژ گوندا بۆ باژێرا ب تایبەتی د وارێ پێشکەفتنا پێشەسازی ل باژێران وەکو مشەختبوونا گوندیێن باشوورێ عێراقێ بۆ باژێرێ بەغدا پایتەخت.

### ٣- پیشەیێن پتر بەلاڤ:

پەیوەندی دناڤبەرا چڕیا ئاکنجیان و پیشەیێن پتر بەلاڤ دا یا هەی، لدویڤ کارێ نێچیرێ بۆ پیشەیا شڤانیێ و چەراندنێ و کشتوکال و پیشەسازی و ل پیشەیا پیشەسازییێدا دگەهتە بلندترین ئاست ژ ئەگەرێ جۆرێ پیشەی و هژمارا وان کەسێن کاری تێدا دکەن، بۆ نموونە پیشەیا نێچیرێ لسەر ئەردی بتنێ دشێت هژمارەکا دیارکری ژ ئاکنجیان ژیانێ بۆ پەیدابکەت، ئانکو چڕی گەلەك یا کێمە، بەلێ پیشەسازی دشێت هژمارەکا گەلەك ژ ئاکنجیان بخۆڤە بگریت، هندەك جارا دگەهتە (٤٠٠) کەسا د هەر کیلومەترەکا چارگۆشەدا وەکو ل ژاپۆن و بەریتانیا دەردکەڤیت.

### ٤- رێکێن ڤەگوهاستنێ:

رێکێن ڤەگوهاستنێ لدویڤ جوٚر و گرنگی و مەبەستا هاتن و چوونێ تێدا رادا پێشکەفتنا دەولەتا ژ لایێ شارستانییێ و ئابووریڤە کاری لسەر زوٚری و کێمیا خرڤەکرنا ئاکنجیان یا هەی، بوٚ ئاڤاکرنا باژێرا لسەر رێکێن هشکاتییێ یان لسەر کەنارێن دەریا (بەندەرا) گرنگیا هەی ژ لایێ گوهوٚرینا کەلوپەلان ژ جهێ بەرهەم ئینانێ بوٚ دەڤەرێن ب کارئینانێ یان ئینانا کەرەستێن خاڤ بوٚ کارگەها.

ئەڤ مەلبەندە دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا بازارەکێ خورت و گەرم و ئاکنجی تێدا پر و زوٚر دبن وەکو باژێرێ لەندەن و هامبورگ ل روٚژئاڤاییێ ئەوروپا و کێشانا هێلا ئاسنی ل روٚژئاڤاییێ یەکگرتیێن ئەمریکا کو بووینە ئەگەرێ زوٚریا ئاکنجیان تێدا و باژێرێ نیویورك و سان فرانسیسکو دروست بوون.

چەند ئەگەرێن دی ژی یێن هەین کو کار دکەنە سەر بەلاڤبوون و ئاکنجیان ژ وان ئەگەرێن ئایینی وەکو ل باژێرێ (بنارس) ل هندستانێ و (کەربەلا) و (نەجەف) ل عیراقێ، ئەگەرێن کارگێری وەکو باژێرێ بەغدا یان ئەگەرێن گەشت و گوزاری ل کوردستانێ دا و کارکرە سەر خرڤەبوونا ئاکنجیان وەکو (شەقلاوە) و (سەرچنار)، و ئەگەرێن مێژوویی ل باژێرا وەکو هەڤلێر و بابل دا دەردکەڤیت.

## چالاكيێن ئابووريێن ئاكنجيان:

ئەو چالاكيە دبيتە ئەگەرا بدەستڤەئينانا مرۆڤی بۆ پێدڤيێن ژيانێ، ئەو رێكێن مرۆڤ دگريتە بەر بۆ ب جه ئينانا پێدڤی و داخازێن خۆ د جودانە ژ چاخەكی بۆ چاخەكێ دی هەتا نوكە پێشكەڤتينە دگەل پێشكەڤتنا شارستانيا مرۆڤی و د وەرارێ دانە، هەر ژ پيشێن دەستپێكی وەكی كۆمكرن و هەلگرتن و نێچيرڤانی و شڤانيێ، پاشی پێشكەڤت بۆ بكارئينانا دارستانێ و كشتوكالی و دەرئينانا كانزا و پيشەسازی، دڤی خشتێ خوارێ دا دابەشكرنا كاركەران بۆمە روون دكەت، لسەر بناغێ پيشەيان، خارێ دكەت كو حەتا ڤێ گاڤێ پيشەيێن سەرەكی پتر ژ (١/٢) كرێكارێن جيهانێ پێڤە دمژيلن. تەماشەی خشتێ ژمارە (٥) بكە.

| بوارێ كرێكاران | رێژا سەدێ بۆ هەموو كرێكاران |
|---|---|
| كشتوكال | ٪٥٢ |
| پيشەسازی | ٪١٨ |
| شڤانكاری | ٪١,٣ |
| دەرئينانا كانزا | ٪١,١ |
| نێچيرڤانی | ٪٠,٥ |
| ب كارئينانا دارستانا | ٪٠,٥ |
| بوارێن ديتر | ٪٢٦,٦ |
| | ٪١٠٠ |

خشتێ ژمارە ( ٥ )

دابەشبوونا رێژا كرێكاران ل دويڤ پيشا دياردكەت

## گرنگترین پیشەیێن مرۆڤی ب کارئینای د قوناغێن مێژوویێدا حەتا ڤێ گاڤێ ئەڤەنە:

١- پیشا کۆمکرنێ و هەلگرتنێ.
٢- پیشا نێچیرڤانییێ.
٣- پیشا شڤانکاری.
٤- پیشا کشتوکالیێ.
٥- پیشا دەرئینانا کانزا.
٦- پیشا پیشەسازی.
٧- پیشا ڤەگوهاستنێ و بازرگانییێ.
٨- پیشا کارێ گوزاری.

١- پیشا کۆمکرنێ و هەلگرتنێ:

ب ساناهیترین و کەڤنترین جۆرێ پیشەیە کو مرۆڤ ل دەستپێکێ یێ پێڤە مژوولبوو، پێکهاتبوو ژ کۆمکرنا بەرهەمێن خورستی و رووەکا، ئەڤ پیشە یا تایبەتە ب کومەلێن دەستپێکی وەکی بەژنکورتا ل دارستانێن کونگۆ ل ناڤەراستا ئەفریقیا.

## ٢- پیشا نێچیرڤانییێ:

### ئەڤ پیشەیە دو جۆرن:

### أ- نێچیرا سەر هشکاتییێ:

پێکهاتیە ژ نێچیرا گیانەوەرێن سەر هشکاتییێ ل ناڤ کیشوەرا دا ب ئامیرو ب هەموو جۆرێن چەکی نێچیرڤان ئەنجام ددەن.

ئەڤ جۆرێ کاری بەرەڤ کێمبوون و نەمانێ ڤە دچیت هژمارا کرێکاران د ڤی کاریدا کێم دبیتن بتنێ نێچیرڤانێن وەکی ئەسکیمویا

ل ئالاسكا ل باكوورێ ئەمریكا باكوور و گرینلاند نێچیرا گیانەوەرێن وەكی كاریبۆ و ئاسكا و رویڤی و زیفی و كێڤریشك هندەك پەلەوەرێن وەكو قاز و وەردەكا، ئەڤ شێوازێ نێچیرێ هندەك جارا شێوازێ نێچیریا بازرگانی وەردگریت وەكو نێچیرا گیانەوەرێن فەرودار.

### ب- نێچیرا دەریا:

زەریا و دەریا و رووبارێن بچوووك جهێن نێچیرا دەریا بۆ مرۆڤی بەرهەڤكریە ژ ڤان داهات و ژێدەرێن خوارنێ بدەستڤە دهێت وەكی گرتنا ماسیا و نەهەنگا و گولكێن دەریایی ب رێكا كومپانیێن جیهانێ نووترین ئامیرێن نێچیرێ هاتیە چێكرن و دهێتە بكارئینان دنێچیرا دەریای دا وەكی ل وەلاتێ ژاپۆن و ئایسلەندادا بكاردهێت.

## ٣- پیشا شڤان كاری:

ئەڤ پیشە ل وان جها یێ بەربەلاڤە ئەوێن بارودوخێ ژینگەها سروشتی ژ لایێ ئاڤ و هەوا گونجایە د گژوگیایێ كورت و درێژی لێ وەراردكەت، وەكی چەروانەك و ئالف مفای ژی وەردگرن، مرۆڤ د ڤی پیشەیدا پێدڤیێن خۆ ژ بەرهەمێن تەرش و گیانەوەران وەردگریت وەكی گوشت و سپیاتی و جل و بەرگ و هری و پیستی، هندەك ژ وان كوچەرێن گەرۆكن و خاسیەتێن شڤانكاریێ پێڤە ددیارن ل وان دەڤەرا كو باران بارین تێرا كشتوكالی ناكەت ل هندەك وەلاتاندا، نوكە ب شێوەكێ پێشكەفتی و شارستانی بكاردهێت وەكو ل ئەوروپا، دەڤەرێن شڤان كاری ل جیهانێدا ئەڤەنە

١- بیابانێن گەرم و هشك گیانەوەری وەكی حێشترا خودان دكەن.
٢- ل دەڤەرێن وەكی (ستێبس) كورتە گیا میە و بزن لێ دهێنە ب خودانكرن.
٣- ل دەڤەرێن (سەڤانا) گژوگیایێ درێژ چێل و گولك و گامێش لێ دهێنە ب خودانكرن.

٤- ل دەڤەرێن ئوراسیا ئاسکارەنە دهێنە بخودانکرن لسەر کورتە گیایێ (تەندرا) گەریانا هاتن و چوونا شڤانان دو شێوازا وەردگریت:

**١- هاتن و چوونا ستوونی (عمودی).**

**٢- هاتن و چوونا ئاسوٚیی (افقی).**

### ١- هاتن و چوونا ستوونی:

شڤان ب پەز و مالێن خوٚڤە ل وەرزێ هاڤینێ ل دەشت و دوٚلاٚ بەرەڤ دەڤەرێن چیا و بلند دچن، بەلێ ل وەرزێ زڤستانێ دهێنە خوارێ ل رەخێن چیا بەرەڤ دەڤەرێن نزم و دەشتان.

ئەڤ شێوازێ گەریانێ ل کوردستانێ ب (دەشت و زوزان) دهێنە نیاسین کو ل هاڤینێ دچن بوٚ زوٚزانا (دەڤەرێن چیایێن بلند) و ل زڤستانێ ڤەدگەرن بوٚ جهێن نزم ل دەشت و دوٚلاٚ جهێن گەرم ل ڤی وەرزی.

### ٢- هاتن و چوونا ئاسوٚیی:

ئەڤ هاتن و چوونە شڤان ل بیابانان ب حوشتر و پەز و مالێن خوٚ ئەنجام ددەن و ل بیابانا روٚژئاڤا عێراقێ و نیمچە گزیرتا عەرەبی دەردکەڤیت

شڤانکاری دو جوٚرن (دەست پێکی و بازرگانی):

ئەوا دهێتە تێبینی کرن د ڤی کاری دا کێمترین چری یا هەی، چونکە کارەکێ سەرەتایی یە و دەرامەتەکێ کێم بدەست دکەڤیت و پرانیا شڤانکارا دەست ژ ڤی کاری بەردا و مژوولێن کارێ کشتوکالی و پیشەسازی بوون و ل گوند و باژێران ئاکنجی بوون.

## ٤- كشتوكال ( چاندن ):

كشتوكال ئەو كارێ رێنجبەریە ئەوێ مرۆڤ شیانێن خۆ تێدا د مەزێخیتن بۆ بكارئینانا ئەردی تاكو ب رێیا زێدەكرنا بەرهەمێ رووەكی و ئاژەلی سامانەك بدەست بكەڤیت و پێدڤیێن خۆ ژ خوارنێ و جل و بەرگا بەرهەڤبكەت، كشتوكال ب بەرێ بناغا ژیانا ئابووری و شارستانیا ئاكنجیان دهێتە دانان ژ قوناغەكا پاشكەفتی و جهگوهورەك بۆ قوناغەكا خۆ جهبوویی و جێگیریا ل گوند و باژێران. هەرێما كوردستانا عێراقێ ب مەلبەندێ ئێكێ یێ زانینا كشتوكالی ل رۆژهەلاتا ناڤەراستدا دهێتە هژمارتن و گوندێ (جەرمو) ل پارێزگەها كەركوك نێزیك چەمچەمال ب كەڤنترین گوندێ كشتوكالی دهێتە دانان.

## دو جۆرە شێوازێن كشتوكال كرنێ هەنە:

(شێوازێ سەرەتایی و شێوازێ بازرگانی) د ڤی كاری دا هژمارەكا زۆرا ئاكنجیان بخۆڤە دگریت. ئەو كارێن ل كشتوكال كرنێ دا دهێنە ئەنجامدان ئەڤەنە:

١- جووت كرن.

٢- پەیت كرن (زبل كرن).

٣- ئاڤدان.

٤- بژارە و ئادەكرن.

٥- دروین.

٦- برن بۆ بازاری.

ئەڤ ئەگەرێن کار دکەنە سەر کشتوکالی پێك هاتینە ژ ئەگەرێن (سروشتی و مرۆڤی)

### ١- ئەگەرێن سروشتی:

وەك ئاڤ و هەوا و ژێدەرێن ئاڤێ و جۆرێ ئاخێ و بلندی و نزمیا ئەردی.

### ٢- ئەگەرێن مرۆڤی:

وەك دەستێ کارکەر و بازار و تیتالێن کۆمەلایەتی و ئەگەرێن مێژوویی و سیستەمێن رامیاری.

کشتوکال بتنێ بەرهەمئینانا بەرووبوومێ رووەکی نینە. بەلکی خودانکرنا سامانێ ئاژەلی بخۆڤە دگریت، بۆ بەرهەم ئینانا گوشتی و شیر و پیست و هری و هەر وەسا (پەلەوەر) بۆ مەرەما گوشت و هێکان. گرنگیا کشتوکالی ل زێدەکرن و بدەستڤەئینانا خوارنێ و کەرستێن سەرەتایی دایە، و هندەك ژ ڤان کەرستان دچنە دناڤ بارێ پیشەسازیدا وەك پەمبی و کتان و لاستیك و روین.

## ٥- کانزاکاری:

مەبەست ژ کانزاکاریێ دەرئینانا دەرامەتێن سروشتیێن سەرئەردی یان ژێر ئەردیە ب هەموو شێوازانڤە (شل، رەق، گاز) ئەڤ کارە گەلەك پێدڤی ب شارەزاییا هونەری و پارەی هەیە بۆ دەرئێخستنا وان.

کانزاکاری دو جۆرن:

١- کانزایێن فلزی (میتال) وەکو (ئاسن، سفر)

٢- کانزایێن نەفلزی(نامیتالی) وەکو (فوسفات، گوگرد، خوێ)

کارێ کانزاکاریێ ل هەموو دەڤەرێن سەر روویێ ئەردی دهێتە بجهئینان ل دەڤەرێن جودا جودا یێن سار و هێن و گەرم و چڕ و پڕ یان کێم ئاکنجی.

دڤی کاریدا زۆری و کێمیا ئاکنجیان رولێ سەرەکی نابینیت لێ رادەیا پێشکەفتنا دەولەتا د بوارێ ئامیرو تەکنولۆژیا نوو دا دڤی کاری دا بکاردئینن.
وەلاتێن پێشکەفتی دڤی کاریدا وەکی وەلاتێن رۆژئاڤایا ئەوروپا و وەلاتێن ئەسکەندەنافیا و ویلایەتێن ئێکگرتیێن ئەمریکا و ژاپۆن.

## ٦- پیشەسازی:

پیشەسازی پێکهاتیە ژ گوهۆرینا کەرەستێن سەرەتایی (گیانداری، کشتوکالی، کانزایی) ژ شێوەکی بۆ شێوەکێ دی کو مفادارتر بیت بۆ مرۆڤی.
بۆ نموونە وەکو گوهۆرینا پەمبی بۆ پەروکێن چێکری یان ئاسنێ خاڤ بۆ ماشین (ماکینە) و ئامیرا یان شیر بۆ نیڤشك و پەنیر و قەیماغ، پیشەسازی ژی دو جۆرن:
أ- پیشەسازیا کەڤن یا بدەستی دهاتە ئەنجامدان کو ب پیشەسازیا دەستی یا ناسیارە.
ب- پیشەسازیا نوو کو ب ئامیر و تەکنولۆژیایێ دهێنە ئەنجامدان.
پیشەسازی رولەکێ گەلەك گرنگ یێ دیتی د گوهۆرینا ژیانا مرۆڤی دا و پێشکەفتنا بارێ ئابووری و شارستانی و کومەلایەتی و رولێ سەرەکی هەبوو د گوهۆرینا ژیانا مرۆڤی دا دڤان باران دا.
١- بلندبوونا داهاتێ ئاکنجیان (کەسی، یان نەتەوەیی) بیت.
٢- وەراربونا بازێرا ژ لایێ هژماری و قەبارێ وان ڤە.
٣- پێشکەفتنا ئاستێ خواندنێ د قوناغێن جودا جودا دا.
٤- بلندبوونا رێژا کرێکاران د پیشەسازیێدا ل جیهانێ.

٥- سنوردارکرنا ریژا ژ دایکبوون وکیمکرنا ریژا مرنێ ژ ئەگەرێ باشبوونا بارێ ساخلەمیێ و بارێ ژیانا ئاکنجیان و دیتنا دەرمانێن نوو.

نموونێن وەلاتێن پێشکەفتی د بوارێن پیشەسازی دا وەکو وەلاتێن رۆژئاڤایێن ئەوروپا و ویلایەتێن ئێککگرتیێن ئەمریکا و ژاپۆن.

## ٧- ڤەگوهاستن و بازرگانی:

مەبەست ژ ڤەگوهاستنێ - ڤەگوهاستنا کەل و پەل و مرۆڤانە ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی، ب ئەگەرێ پێشکەفتنا مەزن یا د بوارێ تەکنەلۆژیا و داهێنانێن نوو دا روودای کارکرە سەر وەرار و بەرفرەهبوونا رێکا و لەزاتیا ڤەگوهاستنێ و رێکێن هشکاتی و ئاڤی و ئەسمانی، ژ بەر هندێ هژمارا کرێکاران دڤی کاریدا بەرەڤ زێدەبوونێ ڤە چوو ژ ئەنجامێ ڤەگوهاستنێ لەزاتی و پێشکەفتن و بازرگانیێ وەرار کر.

بازرگانی.. پێکدهێت ژ ڤەگوهاستنا کەل و پەلا و کەرەستێن خاڤ و دروستکری ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی. بازرگانی دو جۆرن (بازرگانیا نافخۆ و بازرگانیا دەرڤە).

بازرگانیا ناڤخۆ - ل ناڤ سنوورێن جوگرافیا وەلاتەکی یان دەولەتەکێدا روودەدەت، بەلێ بازرگانیا دەرڤە ژ ئەنجامێ ڤەگوهاستنا کەل و پەلا ژ وەلاتەکی بۆ وەلاتەکێ دی روودەت.

ژ ئەگەرێ ڤێ پێشکەفتنا مەزن د وارێ بازرگانی و ڤەگوهاستنێ دا روودایە گەلەك مەلبەندێن بازرگانی د جیهانێدا پەیدابوون و هژمارەکا

گەلەك ئاكنجی تێدا خرڤەبوون وەكی باژێرێن نیویورك و لەندەن و هامبورك و بۆمبای و شەنگەهای.

## ٨- خزمەتگوزاری:

كارێن خزمەت گوزاری گەلەك لایێن ژیانا مرۆڤی ڤەدگریت، وەكی خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ، و فێركرنێ و ئاڤ و كارەبا و... ئەڤ خزمەتگوزاریانە دگەل پێشكەفتنا مرۆڤی ل روویێن شارستانییێ و بەردەوام وەراركریە تا بوویە پیشەكا تایبەت و ڤێ گاڤێ هژمارەكا زۆر ژ كرێكاران د ڤێ بوارێ خزمەتگوزاریدا كاردكەن.

## پرسیارێن پشکا چارێ

پ١/ راست و خەلەتیێن ئەڤانێن ل خوارێ دیاربکە و خەلەتیا راست بکە:

١- زێدەبوونا نەسروشتی ژ ئەنجامێ دایك بوون و مرنێ پەیدا دبیت.

٢- هاتن و چوونا ئاسۆیی ئەو هاتن و چونە شڤان بەزومالێن خۆ وەرزێ هاڤینێ ل دەشت و دۆلا بەرەڤ دەڤەرێن چیا دچن و ل وەرزێ زڤستانێ ل رەخێن چیا بەرەڤ دەڤەرێن نزم دهێن.

٣- کیشوەرێن جیهانا کەڤن (ئاسیا - ئەوروپا - ئەفریقیا) ژ ١٥٪ ی ئاکنجیێن جیهانێ بخوڤە دگرن.

٤- ئاکنجی ل دەڤەرێن جیهانێ چری و پریا وان وەکی ئێکە.

٥- ل دەڤەرا ستێپس چێل و گامێش دهێنە بخۆدانکرن.

پ٢/ ڤان ڤالاییێن ل خوارێ ب پەیڤەکا دروست پربکە:

١- نێچیرڤانی دوو جۆرن أ- ---------------- ب- ----------------.

٢- زێدەبوونا سروشتی پێك هاتیە ژ جوداهی دناڤبەرا ---------------- لگەل ---------------- ل دەمەکێ دیارکری و ل دەڤەرەکا دیارکری.

٣- مشەختبوون دو جۆرن أ- ---------------- ب- ----------------.

٤- ژ ئەگەرێن سروشتی کار ل دابەش بوونا ئاکنجیان دکەن

أ- ---------------- ب- ----------------.

٥- بازرگانی دو جۆرن أ- ---------------- ب- ----------------.

پ٣/ ئەڤانا پێناسە بکە:

١- مشەختبوون ٢- چریا ئاکنجیان ٣- وەرارا ئاکنجیان

٤- کشتوکال ٥- کانزاکاری

پ٤/ ئەگەرێن ئەڤانا روونبکە:

١- ژێدەرێن ئاڤێ کار ل زۆر و کێمیا ئاکنجیان دکەت؟

٢- پەیدابوونا دیاردا دەشت و زوزانان (گەرمیان و کوێستان) ل دەڤەرێن کوردستانێدا.

٣- دابەشبوونا ئاکنجیان ل دەڤەرێن جیهانێ ب شێوەکێ یەکسان نینە.

٤- د پیشەیێ کانزاکاری دا زۆر و کێمیا ئاکنجیان رۆلێ سەرەکی نابینیت.

٥- بلندی و نزمیا پلا گەرمی کار ل کێم بوونا ئاکنجیان دکەت.

## زاراڤ

| | |
|---|---|
| ١- ئاكنجيبوون | Population |
| ٢- ئامار | Statistic |
| ٣- وەرار | Grouth |
| ٤- ژدايكبوون | Birth |
| ٥- مرن | Mortality |
| ٦- دابەشبوون | Distribution |
| ٧- چر و پرى | Density |
| ٨- مشەختبوون | Migration |
| ٩- ڤەگوهاستن | Transportation |
| ١٠- نێچير | Hunting |
| ١١- گشتوكال | Agriclture |
| ١٢- پيشەسازى | Industry |
| ١٣- دەرهێنانا كانزا | Mining |
| ١٤- كارگوزارى | Services |
| ١٥- سامانێ كانزا | Minralresources |
| ١٦- ئاخ | Soil |
| ١٧- مێ | Female |
| ١٨- نێر | Male |

# جوگرافیا کشتی
# پۆلا حەفتێ بنەرەت

## پشکا ئێکێ:

## دەرگەهەك بۆ زانستا جوگرافی

١- پێناسا جوگرافیێ

٢- تایێن جوگرافیێ - سروشتی و مرۆڤی

أ- نەخشە و رەگەزێن وێ:

نەخشە، پیڤەرێن کێشانا نەخشێ

کلیلا رەنگێن نەخشێ، جۆرێن نەخشێ

گرنگترین دیاردێن جوگرافی دیارکرنا وان لسەر نەخشێ زاراڤێن ئینگلیزی - کوردی

پسیارێن پشکا ئێکێ

---

## پشکا دووێ:

## ئەرد و پەیوەندی ب کۆمەلا رۆژێ

پێشەکی: گەردوون و کۆمەلا رۆژێ.

١- هەسارا ئەردی

٢- جولا ئەردی

٣- شێوێ ئەردی        رۆژانە و دیاردا شەڤ و رۆژا: چاروەرزا

٤- بازنێن پانی و هێلێن درێژی

**پسیارێن پشکا دووێ**

--------------------

## پشکا سێیێ:

پێشەکی: بەرگ و دابەشبوونا ئاڤێ – و هشکاتیێ

بەرگێ رەق: پێناسا وێ

بلندی و نزمیا رویێ ئەردی

أ- دەشت ب- دول ج- بانی د- گرك هـ- چیا

٢- بەرگێ ئاڤێ:

أ- دەریا و جۆرێن وێ

ب- زەریا

ج- گرنگیا دەریا و زەریا

٣- بەرگێ گازێ – دەسپێکەك لسەر بەرگێ گازێ

سەقا و ئاف و هەوا

رەگەزێن سەقای و ئاف و هەوای

٤- بەرگێ زیندی

زاراڤ

## پشکا چارێ:

### جوگرافیا ئاکنجیان

أ- دەسپێکەك لسەر جوگرافیا ئاکنجیان

١- سەرژمێری و گرینگیا وێ

٢- دابەشبوونا ئاكنجیان

٣- چری و پریا ئاكنجیان

٤- پێكهاتنا ئاكنجیان

زاراف

پرسیارێن پشكا چارێ.

# بــەنــدێ ئـێـکێ

## پشکا ئێکێ

**پێناسا مێژوویێ:** مێژوو پێکهاتیە ژ تومارا بۆریا مرۆڤی و هەمی پێ گوهورینێن د ناڤبەرا سروشت و کۆمەڵگەهێ دا ب مەرەما تێگەهشتنا ئەڤرۆ و دیارکرنا رێبازا گشتی ل پاشەرۆژێ.

**ژێدەرێن مێژوویا کەڤن:** پێکهاتینە ژ هەمی شوونوار و پاشمایێن دێرینێن مرۆڤی کو هاریکاریا مە دکەن بۆ نیاسینا بۆری پێخەمەت تێگەهشتنا پاشەرۆژا مرۆڤی. بەری داهێنانا نڤیسینێ ل دەسپێکا هزارا سیێ بەری زاینێ ل عیراق و میسرێ. ژێدەرێن مە ژ مێژوویا کەڤن تنێ پێك دهێن ژ پاشمایێن مرۆڤی بجە هێلاین وەکی ئامیرێن بەری و وێنە و نەخشێن لسەر دیوارێن شکەفتا و هەستیکێن مرۆڤا و پاشمایێن رووەکی و پێزانینێن جیۆلۆجی کو پەیوەندیدارن ب گورانکاریێن ژینگەهێ و ئاڤ و هەوای.

پشتی داهێنانا نڤیسینێ ل هزارا سیێ بەری زانینێ نڤیسین لسەر (تەڤنێ و بەری و بەلگێن قەرەمی و چەرمی و کانزا) بوو.

---

بەلگێن قەرەمی: گیایەکە ل گۆمێن مسرێ دهێتە چاندن و مسریێن کەڤن لسەر بەلگێن وان دنڤیسی.

# چەرخێن کەڤن

**چەرخێن بەری مێژوویێ:** ئەو چەرخن یێن هێشتا مێژوو تێدا نەهلتیە نڤیسین. ئانکو دبێژنە چەرخێن بەری داهێنانا نڤیسینێ (چەرخێن بەری مێژوویێ).
ئەڤ قۆناغە گەلەکا کوورە و دەسپێکێن وێ نە هاتینە زانین. بەلێ هەمی چەرخێن بەرینی ڤەدگریت.

**چەرخێن بەرینی:** دبێژنە وان چەرخا ئەوێن مرۆڤی تێدا بەر بکارینای بۆ دروستکرنا ئامیر و پێدڤیێن خۆ یێن رۆژانە بەری داهێنانا ئامانێن ئاخێ (گلێنە) و کانزا.

زانایێن شوونوارا و مێژوویا کەڤن چەرخێن بەرینی دابەشی سێ قویناغێن سەرەکی کرینە:

**١- چەرخێ بەرینیێ کەڤن** **٢- چەرخێ بەرینیێ ناڤەراست**
**٣- چەرخێ بەرینیێ نوو**

**ئێک: چەرخێ بەرینیێ کەڤن:** پاشمایێن چەرخێن بەرینی د کوردستانێدا ل شوونوارێن (بەردەبەلکە) ل نێزیك چەمچەمال و شکەفتا هەزارمێرد ل نێزیك سلێمانیێ و شانەدەر ل هەولێرێ و شکەفتا زەرزی ل نێزیك سورداش یێن هاتینە دیتن.



مرۆڤێ جاوە



مرۆڤێ نیاندرتال

وێنێ ژمارە ( ١ ) مرۆڤێ چەرخێ بەرینی

جۆرێ دەسپێکێ ژناڤچوویێ مرۆڤی کو د قۆناغا چەرخێ بەرینیێ کەڤندا د ژیان وەکی مرۆڤێ (جاوە و نیاندرتاڵ) د کوردستاندا. پاشمایێن مرۆڤێ نیاندرتاڵ ل شکەفتا شانەدەر ل هەولێرێ هاتنە دیتن، هەروەسا دیار بوو کو شکەفتا هەزارمێرد ژی ل سلێمانیێ ژ لایێ هەمان جورێ مرۆڤی ڤە هاتبوو بکارئینان.

مرۆڤێ کرۆمانیۆن مرۆڤەکێ ژیرە ب باپیرێ مەزنێ مرۆڤێ نهو دهێتە هژمارتن.



وێنێ ژمارە ( ٢) مرۆڤێ کرۆمانیۆن

مرۆڤێ چەرخێن بەرین یێ کەڤن ل شکەفتا و رەڤەزا د ژیا. ئاگر زانیە و بکارئینایە. بۆ دابینکرنا خوارنا خۆ یا رۆژانە پشت ب کۆمکرنا دەغل و دانی و بەرهەمێ رووەکێ خۆرستی و نێچیرا گیانەوەران بەستیە و ل هزارا دەهێ بەری زایینێ ئەڤ قۆناغە ب داوی هات.



وێنێ ژمارە ( ٣ ) ڤەدیتنا ئاگری

دو: چەرخێ بەرینێ ناڤەراست: ل هزارا دەهێ بەری زایینێ گورانکاریەکا مەزن ب سەر سەقا و ئاڤ و هەوایێ ئەردی دا هات. پلا گەرمێ ١ و ٥ پلا بلند بوون و داوی ب چەرخێ بەستیێ هات. مرۆڤی شکەفت و رەڤەز بجھ هێلان و بەرەف دەشت و دۆلێن قەلەو چوو و دەست ب کۆمکرنا خوراکی و راڤ و نێچیرا گیانەوەرا کر و ب شێوەکێ بەروەخت د کۆخێن بازنەیدا ئامیرێن بەری وەکی (بەرێ ئاگردان و پارچێن دۆل و دستاری) پیشڤەبرن و چالێن تایبەت بۆ کومکرن و پاراستنا دەغل و دانی دروستکرن. هەروەسا داس دروست کر. ل کوردستانێ پاشمایێن ڤێ قۆناغێ ل (زاوی چەمی) نێزیک شکەفتا شانەدەر و (کەریم شار) نێزیک چەمچەماڵ هاتینە دیتن.



وێنێ ژمارە ( ٤ ) وێنێ چەند ئامیرێن چەرخێ بەرینیێ ناڤەراست

**سێ: چەرخێ بەرینیێ نوو:** ئەڤ قۆناغە د کوردستانێدا بۆ هزارا حەفتێ بەری زایینێ ڤەدگریت و بەردەوام دبیت هەتا ڤەدیتنا نڤیسینێ.

## ژ دیاردێن گرنگێن چەرخێ بەرینیێ نوو:

١- د ڤێ قۆناغێدا مرۆڤ شیا دەست ب چاندنێ بکەت، هەروەسا شیا تەرش و کەوالێ ژی کەهی کەت.

٢- خانوو دروست کرن و ئاکنجیبوونا بەردەوام دەسپێکر و گوند دەرکەفتن و گوهورین ب سەر ژیانا جڤاکیا مروڤیدا هات.

٣- ئامانێن ئاخێ (گلێنە) دروست کرن.

٤- دەرکەفتنا نیشانێن پەرستنێ، بەلگە بۆ ڤێ چەندێ ڤەدیتنا بووکا تەڤنێ لسەر شێوازێ پەیکەرێ خوداوەندێ دایک کو نیشانا هێزا پیتی ژدایک بوونێ یە.





وێنێ ژمارە ( ٥ ) خوداوەندێ دایک ل کوردستانێ

٥- دەرکەفتنا چنین و رستن و دروستکرنا تەشی و دەرزی و قومچان ژ هەستیێن گیانەوەرا.

٦- بەردەوامبوون لسەر بکارینانا بەری بۆ دروستکرنا دستار و بازن و رستك و قاچ و قورێن ناڤ مالێ.

ژ نموونێن ژیانا ڤێ قۆناغێ شوونەوارێن چەرمۆ ل پارێزگەها کەرکوکێ و گوندێ شمشارە ل دەشتا رانیایێ ل پارێزگەها سلێمانیێ.

ل هزارا پێنجێ بەری زایینێ مرۆڤی کانزاڤە دیتیە و بکارئینایە. یەکەم کانزا کو مرۆڤی بکارئینای کانزایێ سفری بوو. ژبەر هندێ ئەڤ قۆناغە دهێتە ناسین ب (قۆناغا چەرخێ بەرینیێ کانزایی) نموونێن ڤێ قۆناغێ شوونواریێن حەلەف ل رەخ و روویێن رووبارێ خابوور و تەپە گەورە ل پارێزگەها نەینەوا.

## پشکا دووێ

### چەرخێن مێژوویێ ٣٢٠٠ ب. ز:

ب داهێنانا نڤیسینێ چەرخێن بەری مێژوویێ ب داوی هاتن و چەرخێن مێژوویی دەسپێکر. ئەڤەژی ل سەنتەرێن ژیاریێ ل دۆلاً ناڤبەرا دو رووباران (میسۆبۆتامیا) ل دەوروبەرێن ٣٢٠٠ ب. ز ل دەوروبەرێن ٣١٠٠ ب. ز ل دۆلاً نیل روو دا ب داهێنانا نڤیسینێ مرۆڤی ب تۆمارکرنا مێژوویێ دەستپێکر.

ل دۆلاً ناڤبەرا دو رووباران نڤیسینا بزماری (مێخی) د نڤیسینێدا بکارهات لسەر تەپکا تەڤنێ ب قەلەمێ سەر سێگۆشە ب کارهینا. ل دۆلاً نیل نڤیسینا هیرۆغلیفی د نڤیسینێدا ب مەرەکەب و قەلەم و فرچە و پەرا لسەر بەلگێن قەرەمی هاتە بکارئینان.

### نڤیسینا بزماری (نڤیسینا مێخی):

نڤیسینا بزماری د چەند قۆناغادا دەربازبوویە ل دەسپێکا پەیدابوونێ دگۆتێ نڤیسینا وێنەیی، چونکە مرۆڤی ل وی دەمی ئەگەر ناڤێ ماسیێ نڤیسیبا وێنێ وێ چێدکر، ئەگەر پەیڤا ژن نڤیسیبا وێنێ وێ چێدکر، بەلێ بێی کو بشێت وێ ژنێ دەستنیشان کەت بڤی رەنگی هندەك تشتێن دی ژی وێنەدکرن. بەرە بەرە مرۆڤی نیشانێن وێنا ساناهیتر لێ کرن هەتا گەهشتە وێ چەندێ کو وێنێن تشتا ب هێلێن ئاسویی و ستوونی دیاردکرن، و بۆ ڤێ مەرەمێ ژی قەلەم ژ قامیشی دروستکر و سەرکێ سێکۆشە بکارئینا، د ئەنجامدا نیشانێن وێنا ب شێوێ بزماری بوون ژبەر هندێ دبێژنێ (نڤیسینا بزماری یان مێخی).



**وێنێ ژماره ( ٦ ) نڤیسینا بزماری (مێخی)**



**وێنێ ژماره ( ٧ ) نڤیسینا بزماری (مێخی)**

## مۆرا لولەیی:

**دەرکەفتنا مۆرا لوولەییا هەڤچەرخ بوو دگەل دەرکەفتنا نڤیسینێ لسەر تەپکێن تەقنێ. مۆر هاتە بکارئینان بۆ دەستنیشانکرن و ناسینا وان کەل و پەلا کو مولکێ مرۆڤەکێ دیارکرینە، هزرا مۆرا لوولەیی ژ بەری یان بەرێن ب بها دهاتنە دروستکرن و کون لێ د کرن هەتا ب زەندکا خۆ ڤەکەن یان بکەنە ستویێ خۆدا ژ بەرزەبوونێ بپارێزن. ئەو وێنە و چەڤەنگ (هێما)یێن لسەر مۆرێ بەروڤاژی ستۆیێ خۆ تێ دکۆلان د اکو ددەمێ مۆرلێدتنێدا ب شێوەکێ راست دەرکەڤن.**



**وێنەی ژمارە ( ٨ ) چەند مۆرێن لوولەیی.**

# پرسیارێن پشکا ئێکێ و دووێ

پ١/ ئەڤێن خارێ پێناسە بکە:

(مێژوو - چەرخێن بەری مێژوویێ - چەرخێن بەرینی - چەرخێن مێژوویێ).

پ٢/ نیشانا ( ✓ ) بۆ رستێن راست و نیشانا ( ✗ ) بۆ رستێن شاش دانە و یێن شاش راستڤەکە:

١- شکەفتا هزار مێرد دکەڤیتە پارێزگەها هەولێرێ و شکەفتا شانەدەر دکەڤیتە پارێزگەها سلێمانیێ.

٢- چەرخێ بەرینیێ ناڤەراست ل کوردستانێ ل شوونوارێ زاوی چەمی ل نێزیك شانەدەر ل پارێزگەها هەولێرێ هاتیە دەستنیشانکرن.

٣- بووکا تەقنێ ل گوندێ چەرموو هاتینە دیتن کو هێمایە بۆ پەرستنا خوداوەندێ دایك.

٤- ل دۆلا دووزێ (دوو روباران) نڤیسینا هیرۆغلیفی بکارهاتیە و ل دۆلا نیل نڤیسینا بزماری (مێخی).

٥- ل هزارا پێنجێ بەری زایینێ مرۆڤی کانزا ڤەدیتیە لەورا دبێژنە ڤێ قۆناغێ چەرخێ بەرینیێ کانزایی.

پ٣/ باسێ دیاردێن گرنگێن چەرخێ بەرینیێ نوو بکە؟

پ٤/ د کیژ قۆناغێدا مرۆڤ فێری چاندنێ بوویە؟ و د کیژ شوونواریدا پاشماوێن ڤێ قۆناغێ هاتینە ڤەدیتن.

پ٥/ ئەڤان ڤالاهیێن خارێ پڕ بکە:

١- زانایێن شوونوارا و مێژوویا کەڤن چەرخێن بەرینی دابەشکرینە بۆ

أ ------------ ب ------------ ج ------------ .

٢- مرۆڤێ کرۆمانیون ب ------------ مرۆڤێ نهو دهێتە هژمارتن.

# پشکا سیێ

## گەلێن دێرینێن عیراقێ:

ل هزارا پێنجێ بەری زایینێ ئەڤ کۆمەلاٚ مرۆڤا د کوردستانێدا د ژیا و لاندکا شارستانیەتێ دامەزراند پشتی ژمارا ئاکنجیێن وێ زێدەبووین و دگەل داهاتێ ئەڤان دەڤەرا نە گونجاین مشەختبوونێ دەسپێکر بەرەف ناڤەراست و ژێریا عیراقێ ل دەڤەرێن دەشتایی ل نێزیک رووبارا ئاکنجیبوون و بەرە بەرە هەر کۆمەڵەك ل دەڤەرەکێ خۆ جھ بوو د ئەنجامدا جڤاکەکێ سەربەخۆ ژ ئەوێن دیتر درست بوو، پشتی هنگێ بوونە بازێرێن دەولەتێ هەر ئێك ژ وان سەرۆکێ خۆ هەبوو.

ژ بەر قەلەویا ئەردی و گونجانا کەش و هەوای (سەقا)ی و هەبوونا ژێدەرێن ئاڤا باش ئاخا دۆلاٚ دوو زێیان ژ کەڤن وەرە دەرفەتا دروست بوونا ژیارەکا پێشکەفتی تێدا هەبوو، بەلگەیێن بزماری باسێ ڤان گەل و نەتەوێن خارێ کریە:

### ١- سومەری:

ئێك ژ گەل و نەتەوێن دێرینێن دۆلاٚ دووزێیە نە کو ل چەرخێن بەری مێژوویێ ئاکنجیێن عیراقێ بوون.

ناڤێ سومەریا ژ ناڤێ هەرێما وان ڤە هاتیە کو د کەڤیتە باشوورێ عیراقێ، سومەری داهێنەرێن نڤیسینێ و سیستەمێ بازێرێ دەولەتێ بوون، خودانێن سەربۆرەکا پێشکەفتی بوون د بیاڤێن هۆنەر و ئاڤەدانکرن و پەیکەرسازی و زانست و ئەدەب و ئایینەدا.

## ژ بازێرێن دەولەتێ پێن ب ناڤ و دەنگ:

وەرکا، ئۆر، ئۆما، لەگەش، ئەریدۆ، شرووپاك، کیش

١- بنەمالا وەرکا: کەڤنترین بنەمالا دەسەلاتدارە لسەردەمێ ڤان بنەمالان ب ناڤ و دەنگ ترین شاه (گلگامش)ە کو خودانێ ئەوێ داستانێ یە یا ب ناڤێ خۆ ناڤکری چیرۆکا وی بەحسێ هەولدانا وی دکەتن بۆ بدەستڤەئینانا نەمری و گەهشتن ب رێزا خودایا بەلێ ل دوماهیێ شکەستنێ دخۆت و تێ دگەهیت کو نەمری ب کریارایە نە ب کەلەخیە (جەستە)ی.

٢- بنەمالا ئۆر: ژمارەکا شاه دڤێ بنەمالێدا دەسەلاتداری کریە و پاشمایێن وان ل گورستانا شاهیێن وان دیتینە. ژ وانا هندەك تشتێن ب بهایێن شا ژنا (پوئابی) و کچەمیر (مسی. کلام. دل).

ئەو تشتێن ل باژێرێ ئۆر هاتینە دیتن دیاردکەن کو نەتەوێن (سامی) بەرە بەرە ژ نیمچە دۆرگەها عەرەب بەرەف ناڤبەرا هەردوو رووبارا دەست ب مشەختبوونێ کریە.



وێنێ ژمارە ( ٩ )

شاژنا پوئابی

**٣- بنەمالا ئۆما:** ناڤدارترین شاهنە، شاهێ ئۆما (لۆگال زاگیزی) دوماهي شاه بوو کۆ هەولا رێکخستن و ئێککگرتنا هەمی بنەمالا دا و شیا بۆ ماوەکی دەسەلاتەکا ئێککگرتی پێکبینیت و هەمی بنەمالێن دی بێخیتە ژێر دەسهەلاتا خۆ.

**٤- بنەمالا لەگەش:** (ئۆروکاجینا) ناڤدارترین شاهێ ڤێ بنەمالێ یە، ئێکەمین کەس بوو ژمارەکا یاسا دانای ژبۆ رێکخستنا بارێ رامیاری و ئابووری.

شەر د ناڤبەرا باژێرێن دەولەتا ئۆما و لەگەش لسەر ملکداریا ئەردی و جویێن ئاڤدانێ یێ بەردەوام بوو، دوماهیێ (لوگال زاگیزی) شاهێ ئۆما سەرکەفت و باژێرێن دەولەتا لەگەش ئێخستنە ژێر دەسهەلاتا ئۆما. ل دوماهیێ سۆمەری نەشیا خۆ ل بەر پێلێن مشەختبوونا بەردەواما نەتەوێن سامی راگرن. لەورا ئەکەدی شیان جهێ وان بگرن و دەسەلاتا سومەریيا ب دوماهی بینن.

## ٢- ئەکەدی: ٢٣١٧ - ٢٢٣١ (ب. ز)

ئێکەمین پێلا نەتەوێن سامینە ژ نیمچە گزیرتا عەرەبی ڤە هاتین و ل ناڤەراستا عیراقێدا ب رەخ سومەریيا ڤە ئاکنجیبووین و باژێرێ (ئەکەد) کریە پایتەختێ خۆ و ناڤێ وان ژی ژ ناڤێ ئەڤی باژێری هاتیە.

ئەکەدی شیان دەولەتەکا ئێککگرتی دامەزرینن کو پرانیا خاکا عیراقێ ڤەگرت و بەرەف دەڤەرێن ژ دەرڤە وەلاتێ عیلام و ئەنادۆل چوون و دەسهەلاتا وان گەهشتە گزیرتا قوبرس.

سەرجۆنێ ئەکەدی ب دامەزرێنەرێ ئیمپراتۆریەتا ئەکەدی دهێتە دانان.



وێنێ سەرجۆنێ ئەکەدی

بەلێ (نرام سین)ێ نەڤیێ وی ناڤدارترین شاهێ ئەکەدیە، شەرێ لگەل لولوبیا و گوتییا کری کو ئاکنجیێن کەڤنێن کوردستانێ نە. ئەکەدیا گوهۆرین ب سەر هونەرێ پەیکەسازیدا ئینا و ژ لایێ زمانی و بیروباوەرانڤە د جودابوون ژ سومەریا. دەولەتا ئەکەدی ژ ئەنجامێ هێرشا گوتیا بۆ سەر پایتەختێ وان سالا ٢٢٣١ ب. ز هاتە ژ ناڤبرن.




وێنێ ژمارە ( ١٠ ) نەخشێ بەلاڤبوونا نەتەوێن نیڤچە گزیرتا عەرەب (نەتەوێن سامی)

## ئیمپراتۆریەتا ئۆر یا سیێ ۲۱۱۱ - ۲۰۰٤ ب. ز:

ل دوماهیا دەسهەلاّتا گۆتیا شاهەکێ سۆمەری ب ناڤێ (ئۆتۆحیکال) ل باژێرێ وەرکا دژی گۆتیا سەرهلدا، ئەڤێ سەرهلدانێ هەمی باژێرێن سۆمەری ڤەگرتن، بڤێ چەندێ سەردەمێ سەرهلدانا نوو یا سۆمەری دەسپێکر.

ئۆتۆحیکال ماوێ حەفت سال و نیڤا دەسهەلاتدار بوو پاشی ئۆرنەمۆ شاهێ باژێرێ ئۆر شیا هەمی وەلاّتی رێك بێخیت و ئیمپراتۆریەتا ئۆرا سیێ دامەزرینیت کو پتر ژ سەد سالاّ بەردەوام بوو، ناڤێن شاهێن وان ژی ئەڤە بوون:

١- ئۆر نەمۆ

٢- شولکی

٣- ئەمارسین

٤- شوسین

٥- ئەبی سین

شاهێن ڤێ بنەماڵێ پووتەکێ مەزن ب خواندن و بیناسازیێ و هونەرێ ئابووری و سەربازیدا. ئێك ژ گرنگترین کارێن ئۆرنەمۆ یاسایا وێ بوو کو بناڤێ (یاسایا ئۆرنەمۆ) دهاتە نیاسین.

ل دوماهیا سەردەمێ شاهێ وان یێ دوماهیێ (ئەبی سین) هەوا دووێ یا مشەخت بوونا ئاموریا بەرێ خۆ دا باشوور و ناڤەراستا عیراقێ، بارێ وەلاّتی تێکدا و دەسهەلاّت سست بوو، بەڵێ ئەڤ ئیمپراتۆریەتە ژ ئەنجامێ هێرشا هەڤپەیمانیا عیلامی - سوئی ژ ناڤچوو، دەمێ عیلامیا ژ باشوورێ ئیرانێ و سوئیا ژ کوردستانێ پێکڤە ل سالاّ ۲۰۰٤ ب.ز هێرش کریە سەر ئۆرا پایتەخت.

پشتی ژ ناڤچوونا ڤێ ئیمپراتۆریێ دەمەکێ نەدیار ژ دیرۆکا عیراقا کەڤن دەسپێدکەت دبێژنێ سەردەمێ (ئیسن – لارسا) هەتا هاتنا حەمورابی بۆ سەر حوکمی ل سالا ۱۷۹٤ ب. ز.



وێنێ ژمارە ( ۱۱ ) شاه ئۆرنەمۆ ئامیرێن کێشان و پیڤانێ ژ خوداوەندێ هەیڤێ وەردگریت

## ۳- سەردەمێ بابلیێ کەڤن و هاتنا ئامووریا ۱۸۹٤ – ۱۵۹۵ ب. ز:

ژ ئەنجامێ شەڕ و ئاژاوا دناڤبەرا بنەمالا ئیسن و لارسادا کومەکا ئامووریا ژ سوریا بەرەف ناڤەراستنا عیراقێ هاتن و ل باژێرێ بابل ئاکنجی بوون، شیان دەولەتەکا نوو دامەزرینن کو ب دەولەتا بابلیا ئێکێ دهاتە نیاسین، یان سەردەمێ بابلیێ کەڤن، ئامووری ژی هەر ژ گەلێن سامی بوون کو ل دەسپێکێ بەر ب شامێ (سوریا) چووبوون.

## حەمورابی ( ١٧٩٤ - ١٧٥٢ ) ب. ز:

پشتی بنەمالا لارسا شیای بنەمالا ئیسن ژناڤ ببەت بنەمالا وی ب خۆ ژی بێ هێز و لاواز بووی، حەمورابی، شاهێ شەشێ یێ بابل شیا دەست بسەردا بگریت و دەسهەلاتا وان نەهێلیت، ژبلی ئێکخستنا وەلاتی حەمورابی گەلەك کارێن شارستانی کرینە، بەلێ گرنگترین کارێن ڤی شاهی ئەو کۆما یاسایان بوو یا ب ناڤێ وی دهێتە نیاسین.

## یاسایێن حەمورابی:



وێنێ ژمارە ( ١٢ ) حەمورابی

لسەر میلەکێ رەش هاتینە تۆمارکرن، پشکا سەری وێنێ حەمورابی نیشاددەت ل بەردەم خوداوەند (شەمەش) خوداوەندێ راستیێ و دادوەریێ یاسایێن خۆ ژێ وەردگریت. پشکا خارێ (٢٨٢) برگێن یاسایێ تێدانە کو هەمی بیاڤێن ژیانێ ڤەدگریت.

حەمورابی شیا مفای ژ یاسایێن کەڤن یێن عیراقێ وەربگریت و کۆمکەت و سەر ژ نوو کاری تێدا بکەت. بۆ ماوێ ٤٢ سالا حوکمێ ل عیراقێ کری.



وێنێ ژمارە ( ١٣ ) میلێ حەمورابی

## ٤- ئاشوری:

لڤەکن ژ نەتەوێن سامی ژ نیمچە گزیرتا عەرەب مشەختبووینە ل باکوورێ رۆژئاڤایا عیراقێ ل رەخ و روویێن رووبارێ دیجلە ئاکنجیبووینە. ناڤێ وان ژ ناڤێ خوداوەندێ وان یێ سەرەکی (ئاشوور) هاتییە و ئێکەمین پایتەختێ وان ژی هەر ب ڤی ناڤی هاتیە نیاسین

ل دەسپێکا دەرکەفتنا وان د مێژوویێدا ل هزارا سیێ بەری زایینێ نەشیان دەسەلاتا خۆ ب چەسپینن ژ ئەگەرێ بهێزیا بنەمالێن ناڤەراست و باشوورێ عێراقێ و سوباری و خوری ل کوردستانێ و حیسیا ل ئەنادۆلێ. بەلێ ل هزارا دووێ بەری زایینێ دەرکەفتن وەکو نەتەوەکێ خودان دەسهەلات ژ لایێ جەنگ و داگیرکرنێ ڤە و ژ لایێ داهێنان و شارستانییەتێ ڤە سەربۆرەکا پێشکەفتی هەبوو، سەردەمێن دەسهەلاتا ئاشووریا بۆ سێ سەر دەما دهێتە دابەشکرن:

١- سەردەمێ ئاشووریێ کەڤن ٣٠٠٠ - ١٥٠٠ ب. ز
٢- سەردەمێ ئاشووریێ ناڤین ١٥٣٠ - تا دەسپێکا چەرخێ نەهێ بەری زایینێ
٣- سەردەمێ ئاشووریێ نوو ل دەسپێکا سەدێ نەهێ بەری زایینێ - تا ژناڤچوونا دەولەتا ئاشووری لسەر دەستێ هەڤپەیمانیا میدی - کلدانی ل سالا ٦١٢ ب. ز

ژ شاهێن ب هێزێن ئاشووریان:

| | |
|---|---|
| شەمشی ئەدەدێ ئێکێ | ١٨١٤ - ١٧٩٢ ب. ز |
| شەلمانسەرێ سیێ | ٨٥٨ - ٨٥٤ ب. ز |
| شەلمانسەرێ پێنجێ | ٧٢٦ - ٧٢٢ ب. ز |
| سەرجۆنێ دووێ یێ ئاشووری | ٧٢١ - ٧٠٥ ب. ز |
| سەنحاریب | ٧٠٤ - ٦٨١ ب. ز |
| ئەسەرحەدوون | ٦٨١ - ٦٦٩ ب. ز |
| ئاشوور بانیبال | ٦٦٨ - ٦٢٧ ب. ز |


سەرجۆنێ دووێ یێ ئاشوری


ئاشوور بانیبال



وێنێ ژماره ( ١٥ ) گایێ باڵدار نموونێ هێز و مێرخاسیا ئاشووریان

## ژناڤبرنا دەولەتا ئاشووری:

ژ ئەگەرێ بەرفرەهبوونا دەولەتا وان، بەلاڤبوونا سوپایێ وان د هەمی هەرێما دا، ئاشوریا بەرە بەرە مەرکەزیەتا خۆ ژ دەست دا ب تایبەتی پشتی مرنا ئاشوور بانیبال چەند شاهەکێن لاواز و بێهێز هاتنە سەر حوکمی.

د ڤی دەمی دا، ل چیایێن زاگرۆس ل کوردستانێ، دەولەتا میدیا ل گۆپیتکا هێز و شیانێن خۆ بوو ب تایبەتی لسەر دەمێ (کەیخەسرەو)ێ میدی کو شیا هەڤپەیمانەکێ لگەل شاهێ کلدانی ل بابل (نەبوبلاسەر) گرێدەت و پێکڤە هێرش کرە سەر (نەینەوا) پایتەختێ ئاشووریا و ل سالا ٦١٢ ب. ز ئەڤ دەولەتە ژناڤبر.

## سەردەمێ بابلیێ نوو (کلدانی) ٦٢٦ - ٥٣٩ ب. ز:

ل داویێن سەردەمێ دەسهەلاتداریا شاهێ ئاشووری (ئاشوور بانیبال) و ل باژێرێ بابل دەولەتەکا سەربەخۆ دەرکەفت کو بەری هینگێ بسەر ئاشووریا ڤە بوو. و لسەر دەمێ نەبوبلاسەرێ کلدانی ل سالا ٦٢٦ ب. ز سەربەخۆیا خۆ راگەهاند.

باژێرێ (بابل) پایتەختێ ڤێ ئیمپراتۆریێ بوویە و بوو مەزنترین بنگەهێ شارستانیێ د جیهانا کەڤندا. هەڤپەیمانیا کلدانیا لگەل میدیا کو لسەر دەمێ (نەبوبلاسەر) هاتە گرێدان هەتا سەردەمێ کورێ وی (نەبوخەدنەسر) یا بەردەوام بوو. ئەو ژی ب رێیا ژن خوازیێ کو د ناڤ بەرا وان دا هەبوو. بەلێ ل داویێ هەلوەشیا و کار پێ نەهاتە کرن. لسەر دەمێ (نەبوخەدنەسر) سنۆرێ دەولەتا بابلی گەهشتە کەنارێن دەریایا ناڤەراست (سوریا و لوبنان و فەلستین بخۆ ڤەگرتن). ژ ئەنجامێ شورەشا جوهیێن دەولەتا (یەهودا) دو جارا هێرش کرە سەر وان. بۆ جارا دووێ باژێرێ (ئۆرشەلیم) گرت و چل هزار جوهی ب ئێخسیری ئینانە بابل ئەڤەژی ب (تالانێ بابل) بەرنیاسە ب رامانا تالانێ بابلیا بۆ باژێرێ ئۆرشەلیم. (نەبوخەدنەسر)ی گەلەك پووتە ب کارێ ئاڤەدانکرنێ و پێشکەفتنا دەولەتا خۆددا. ژ پاشمایێن ڤی شاهی باخچێن هلاویستیێن بابل و (شارع الموکب) و کۆچك و شیرهێن باژێرێ بابل و دەرازینکێن وی ب تایبەتی دەرازینکا عەشتار. پشتی نەبوخەدنەسری چەند شاهەکێن لاواز هاتنە سەر حوکمی و نەشیان دەولەتا خۆ بپارێزن. د ئەنجامدا کورشێ ئەخمینی (هەخامەنشی) ل

ل سالا **٥٣٩** ب.ز هێرشەك كرە سەر بابل و داگیركر و دەسهەلاتا كلدانیان ب داوی ئینا.

ب ژناڤبرنا دەولەتا كلدانی عیراق كەفتە بەر هێرشێن نەتەوێن:

ئەخمینی و یۆنانی و سلوقی و ئەشكانی و ساسانی هەتا سالا **٦٣٧** ز دەمێ موسلمان شیاین دەستێ خۆ داننە سەر سەرانسەری عیراقێ و پشتی هینگێ هەمی كوردستانێ ژی.

## پـــرسيـــــار

پ١/ ئەڤان رستێن خارێ پر بکە:

١- ناڤێ سومەری یا ژ -----------هاتیە کو دکەڤیتە----------- .

٢- ژ باژێرێن دەولەتێن سومەری یێن ب ناڤ و دەنگ باژێرێن

١- ----------- ٢- ----------- ٣- ----------- .

٣- سومەری نەشیان خۆ راگرن ل بەر پێلێن مشەختبوونا بەردەوام یا ----------- .

٤- ----------- ب دانەرێ دەولەتا ئەکەدی تێتە هژمارتن.

٥- دەولەتا ئەکەدی ژ ئەنجامێ هێرشا ----------- بۆ سەر پایتەختێ وان و ژ ناڤ چوو ل سالا ٢٢٣١ ب. ز.

پ٢/ ئەڤێن خارێ پێناسە بکە.

١- سومەری

٢- ئەکەدی

٣- ئاشووری

٤- کلدانی

پ٣/ نیشانا ( ✓ ) بۆ رستا راست و نیشانا ( ✗ ) بۆ رستا خەلەت دانە.

١- گلگامیش ئێکە ژ شاهێن ب ناڤ و دەنگێن بنەمالا لەگەش.

٢- ئورنەمو دامەزرێنەرێ بنەمالا ئورا سیێ یە.

٣- شاه حامورابی ئێکەم دانەرێ یاسایێ یە د عیراقا کەڤن دا.

٤- باژێرێ نەینەوا ل سالا ٧١٥ ب. ز لسەر دەستێ میدیا و کلدانی یا ژ ناڤ چوو.

٥- سومەری داهێنەرێن نڤێسینێ نە.

# بەندێ دووێ
## گەلێن دێرینێن کوردستانێ

### پشکا ئێکێ:

#### ١- لۆلۆیی:

لۆلۆیی ژ کۆمەلا ئاکنجیێن چیانە ل پشکا ژوری یا زنجیرا چیایێ زاگرۆس ئاکنجیبووینە ل ناڤ بەرا هزارا دووێ (ب.ز) هەتا سەدا نەهێ (ب.ز) شیان دەسهەلاتا خۆ لسەر دەڤەرێن زەهاو و شارەزوور (دەڤەرا سلێمانیێ یا نهو) بسەپینن، وەلاتێ وان ژ لایێ ئاشوریاڤە ب (زاموا) بەرنیاسە، ژ لایێ نەژادی ڤە دگەهنە گەلێن هند و ئەوروۆپی کو ب نەژادێ (ئاری) ناسیارن.

دەنگ و باسێ ڤی تۆخمێ کەڤنێ کوردا ژ چەند ژێدەرەکێن ئەکەدیا گەهشتینە مە، ژ ڤان ژێدەران نامەکا سەرجۆنێ ئەکەدی (٢٥٣٠) ب.ز هەروەسا لسەر مۆرەکا لوولەیی کو ل ڤان داویا هاتیە دیتن ئاماژێ ب پێکدادانەکا لۆلۆییا دکەت بەرامبەر داگیرکەرێن ئەکەدی. هەروەسا ب دژواری بەرسینگێ هێرشا لەشکر یا (نەرام سین) ی گرتیە، لگەل ڤێ چەندێ ژی ئەکەدیا سەرکەفتن ب دەست خۆ ڤە ئینا و دەڤەرێن وان داگیرکرن و ئەڤ روودانە لسەر میلەکی بناڤێ میلێ سەرکەفتنێ تۆمار کر ل دەڤەرا قەرەداغ و ل دەربەندێ گاور. پشتی مرنا نەرام سین لۆلۆیی شیان خۆ لبن دەستێ ئەکەدیا رزگار کەن، ئەو بوو شاهێ لۆلۆییا (ئانوبانین) شیا شکەستنەکا مەزن بێخیتە ئەکەدییا. ئەوی ژی ئەڤ سەرکەفتنە ل چیایێ (بادیر) ل دەڤەرا (سەربیل زەهاو) ل رۆژهەلاتا کوردستانێ لسەر کەڤرەکی تۆمارکر.

لۆلۆییا چەند پاشمای و کارێن هونەری یێن جوان و رەنگین ل وەلاتێ خۆ بجە هێلاینە کو ئاستێ بلندێ شارستانیا وان نیشان ددەن، ئەڤان لسەر دەمێ ئاشوریا د هۆنەرێ ئاڤاکرنێدا ناڤ و دەنگێ خۆ دەرئێخست. هەر ژ بەر ڤێ چەندێ شاهێن ئاشوری هژمارەکا زۆرا وان برنە باژێرێن خۆ و ل وێرێ ژی ب هوستا و کارزانێن باش هاتنە نیاسین، ل ڤان باژێرا هژمارەکا ئاڤاهی و پەیکەران دروستکرن.



وێنێ هژمارە ( ١٦ ) میلێ سەرکەفتنێ
ل دەربەندێ گاور

## ٢- گـۆتـى:

كوردستان ب وەلاتێ ئێكێ يێ نفشێ مرۆڤێ دووێ دهێتە هژمارتن. ئەڤەژى پشتى كو كۆمەلێن مرۆڤان ژ وەلاتێن خۆيێن رەسەن مشەخت بووين بۆ وەلاتێن خۆيێن نوو كو بەرى هنگێ كۆمەلا گەلێن زاگرۆس تێدا د ژيان كو پێكهاتبوون ژ سوبارى و لولو و گۆتى و هۆرى (ميتانى) و كلدى (خلدى) يان كو هەمى ژئێك نفشن، هەمى ڤەدگەرنە ڤە بۆ كۆمەلا گەلێن هند و ئەوروپى، ئەڤ هۆزە هەمى پێكڤە نفشێ ئێكێ و كەڤنێ گەلێ كوردن. كوردستان كو ژينگەهەكا چياييە ئەڤ گەلە ب هەڤرا دژيان و زمانێ تايبەتێ خۆ هەبوويە، رەوشت و تيتالێن وان يێن كۆمەلايەتى پێشڤە چووينە و شارستانى يا خۆ ئاڤاكريە، گۆتى كو كەڤنترينێن ژ ڤان هۆزا بوون ل دوماهيێ شيان بەرى (٢٠٠٠) ب.ز مەملەكەتا سەربخۆ يا خۆ دامەزرينن. گوتى يا هێزێن خۆ رێكخستن و دەستێ خۆ دانا سەر وان ئەردێن نێزيك دەستهەلاتا خۆ و لژێر سيبەرا ئێك سەركردە ئێكەمين دەولەتا كوردى د مێژوويێدا دروست بوو كو بناڤێ وەلاتێ (گۆتيام) بەرنياسە.

گۆتيام د زمانێ ئاشووريدا بناڤێ (ئەردێ شەركەرا) دهێت. ئارابخا (كەركووكا نهو) پايتەختێ وان بوو. سنورێ وان د ناڤبەرا زێيێ مەزن و سيروان‌دا بوو لسەر دەمێ شاهێ گۆتى يا (ئيلوا لوميش). گۆتيا ل سالا ٢٦٩٤ ب.ز وەلاتێ (سومەر و ئەكەد) داگير كر، بڤى رەنگى سنورێ دەولەتا وان بەرفرەهـ بوو، شاهێ وان ب (فەرماندارێ چار لايێن جيهانێ) و (شاهێ بهێزێ ئەكەد) بەرنياس بوو، دەستهەلاتا گۆتى لسەر وەلاتێ سومەر و ئەكەد نێزيكى چەرخەكى و چارێكا

چەرخەکی ڤەکێشا و دڤی دەمیدا (٢١) شاهیێن گۆتیا حوکم کریە کو (تریگان) دوماهی شاه بوو، پشتی سالاٚ ٢٥٢٤ ب.ز دەسهەلاٚتا گوتیا بەرە بەرە بەرەڤ لاوازیێ هات و د ئەنجامدا دەستهەلاتا خۆ ژ دەست دا و گرنگترین ئەگەرێن کەفتنا وان ڤەدگەرن بۆ:

١- دوریا وان دەڤەرێن دەست ب سەردا گرتی ژ بنگەهێ دەستهەلاتا وان.

٢- لاوازیا هنارتنا هاریکاریێن لەشکری و درەنگ گەهشتنا وان بۆ وان جهێن دور.

ژ گرنگترین وان کارێن هونەرێن کو ئاستێ بلندێ شارستانیا گۆتیا دیار دکەت.

١- تابلویێ لیشیر - پیرانی ل گومێن شێخان (باکورێ خانەقین).

٢- سەرێ ئێك ژ شاهێن گۆتی کو ژ برونزی هاتیە درست کرن ل دەوروبەرێن باژێرێ هەمەدان ل ئیرانێ هاتیە دیتن و نهو ل مۆزەخانا (بریمەر کالیری) ل باژێرێ نیویورك ل ئەمریکا هاتیە پاراستن.

٣- هەروەسا سەرێ ئێك ژ شاهێن وان ل سلماس (رۆژهەلاتێ کوردستانێ) هاتیە دیتن لگەل دیتنا چەند مۆرەکێن لولەکی ل باشوورێ نهو یێ عیراقێ.

(ئۆتۆحیکال) شاهێ سۆمەریا دژی گۆتیا شورەشەك کر و شیا ب تەواوی دەسهەلاتا گوتیا ل وەلاتێ سۆمەر و ئەکەد نەهێلیت. پشتی ڤێ روودانێ گوتی ڤەگەریانە دەشت و چیایێن زاگرۆس.

## ٣- میتانی:

ئەڤ گەلە ژ هوریا (خوریا) بوون کو ل کوردستانا رۆژئاڤا دەسپێکا ئاکنجیبوونا وان ل دەوروبەرێن روبارێ بلێخ و خابوور بوو، دەسپێکا دەرکەفتنا وان ڤەدگەریتە چەرخێ چارێ ب.ز. میتانی ژ تۆخمێ ئاری نەژادن، باژێرێ واشوکانی (راس العین) ل رۆژئاڤایێ کوردستانێ پایتەختێ وان بوو، میتانیا پەیوەندی لگەل مسریا هەبوون و نامە گوهۆرین ل گەل مسریا هەبوو ب تایبەتی لسەردەمێ شاهێ میتانیا (توشراتا) و فیرعەونێن مسرێ، وەلاتێ میتانی ب ناڤێ (خانیگلبات) ژ لایێ ئاشوری یا ڤە ناڤداربوو، ل دەڤەرا کەرکووکێ هژمارەکا بەلگەنامێن دەولەتا میتانی هاتینە دیتن، رۆژهەلاتناس (جۆنس) دبێژیت پەیڤا میتانی ب رامانا (خانەدان) دهێت.

میتانی بەردەوام لگەل ئاشوریا ب شەر بوون لسەردەمێ شاه شەلمانەسرێ ئێکێ ١٢٧٣ - ١٢٤١ ب.ز دەسهەلاتا وان شکەستن ئینایە مسریا دگۆتە میتانیا (نەهارین) و د تەوراتێدا ب (ئارام - نەهارام) ناڤ برینە.

## ٤- کـــاشی:

چەند هۆزەکێن ئاکنجیێن چیایێ زاگرۆس بوون ب تایبەتی ل دەڤەرا (کرماشان و لورستان) دژیان و بەرەف عێراقێ هاتینە ب سەرکردایەتیا شاه (ئاگومێ دووێ) بۆ ماوێ چار چەرخا دناڤ بەرا ١٥٩٥ - ١١٦٢ ب.ز دەست بسەر وەلاتێ بابلدا گرتیە ژ بەر ئەگەرێ هێرشا شاهێن بابل بۆ سەر دەڤەرا وان. کاشیا بۆ جارا ئێکێ هەسپ ئینانە دولاّ ناڤبەرا دو رووباران و پێنگاڤەکا مەزن بوو د پێشڤەبرنا شارستانییێدا.

دەولەتا وان ب ناڤێ کاردونیاش ناڤدارە وەسا دیارە ناڤێ کاشیا ژ ناڤێ خوداوەندێ وان هاتبیت کو ب (کاشو) بەرنیاسە ل عیراقێ کاشیان بخو پایتەختەکێ نوو بۆ خۆ دروستکر و بناڤێ شاهێ خۆ یێ ناڤدار (دورگوریکالزۆ) ناڤکر ئانکو بازێرێ کوریکالزو، کو نهۆ ل نێزیك بازێرێ بەغدا پاشمایێن وی ناڤدارن ب (عەقەرقوف) و زەقورا وی یا ناڤدار هەتا نهو مایە کو ژ چەند قاتا هاتیە دروستکرن ب بلنداهیا دو سەد پێیان ب نەخش و شێوازێ جوان وێنێ کوریکالزوی تێدا دیار دکەت. هەر دڤی بازێریدا سێ پەرستگەهێن مەزن هاتینە دیتن. کاشیا گەلەك پووتە ب هەسپ سیاریێ دایە و خودانکرنا وان ب تشتەکێ پیرۆز زانیە. هەروەسا کاشیا دەستەکێ بلند هەبوویە د هۆنەرێ ئاڤاکرن و نەخشەسازی و چێکرنا رێیادا. ل دەوروبەرێن سالێن ١١٦٢ ب.ز عیلامی شیان هێرشێ بیننە سەر کاشیان و پایتەختێ وان کاڤل بکەن و سامانەکێ زۆر و کارێن هۆنەرییێن گرنگ ڤەگۆهێزنە پایتەختێ خۆ (سوسە).

## پشکا دووێ

### مـیــدی:

پشتی تەواوبوونا حوکمێ گۆتیا، ل دەوروبەرێن سالاٚ ٢٠٠٠ ب.ز پێلەکا مەزنا هند و ئەوروٚپیا ل دەڤەرا زاگروٚس دیاربوون و لگەل گۆتیا تێکەل بوون و پێکڤە ژیان ئەڤە ب میدی دهێنە نیاسین، شیان ئێکەمین ئیمپراتۆریەتا مەزن د مێژوویا کەڤنا کوردیدا دامەزرینن کو سنوورێ وێ ژ رۆژهەلاتی ڤە دەربازی رووبارێ (سەرداریا) بوو ل ئاسیا ناڤەراست، ژ باکوری ژی هەتا گولا قەزوین و دەریایا رەش، ژ رۆژئاڤای ڤە هەتا رووبارێ هالیس (قزل ئیرماق) درێژبوویە، ل سالاٚ ٦٥٠ ب.ز ب تەواوی دەست ب سەر دەڤەرێدا گرت. ب ڤێ چەندێ شیان بناغەکێ بهێز بۆ حکومەتەکا ناوەندیا بهێز دامەزرینن. پشتی ئەڤە بدەست میدییاڤە هاتی پتر بەرەڤ دەستدرێژیێ و داگیرکرنێ چوون.



وێنێ ژمارە ( ١٧ )

چەند زەلامەکێن (میدییا) یان (ماننا)، چەرخێ هەشتێ ب.ز

هەرگاڤ شەڕ د ناڤبەرا هەردو دەولەتێن میدی و ئاشووریادا هەبوو. ل سالا ٧١٥ ب.ز (سەرجۆن)ێ شاهێ ئاشووری شیا میدیا بشکێنیت و باجێ ژێ بستینیت. پشتی هینگێ شاهێ میدیا (دیاکۆ) ل سالا ٧٠٠ ب.ز باژێرێ (ئەکباتانا) (هەمەدانا نهو) کرە پایتەختێ میدیا پشتی مرنا دیاکۆ حوکم کەتە دەستێ کورێ وی (فراورتس)، وی ژی لگەل ئاشووریا پەیمانا ئاشتییێ گرێدا. ئەڤ کارە بۆ وی ڕێخوشکەر بوو کو دەست بسەر فارساندا بگرت.

## کیاکسار (کەی خەسرەو) ٦٥٣ - ٥٨٥ ب.ز:

ناڤدارترین شاهێ میدیایە، لسەردەمێ وی دەولەتا میدیا گەهشتە بلندترین دەسهەلات و گۆپیتکا گەشەکرنێ.



وێنێ ژمارە (١٨)

ل داویا سالا ٦١٥ ب.ز میدیا هۆزێن خۆ کۆمکرن و دەست ب هێرشا کر بەرەڤ سنوورێ ڕۆژهەلاتا ئاشووریا. هەر د وێ سالێدا شیان

باژێرێ (ئارابخا - کەرکووکا نهو) و ئەربائیلۆ (هەولێرا نهو) رزگار بکەن.

سالا ٦١٤ ب.ز هێزێن وان ب تەواوی بەرەف باژێر و بنگەهێن ئاشووریا برێکەفن. دڤی دەمیدا شاهێ میدیا (کیاکسار) و (نەبوبلاسەر) ێ شاهێ کلدانی هەڤپەیمانەك گرێدا بۆ لێدان و ژناڤبرنا ئیمپراتۆریەتا ئاشووری.

هەردو سەرکردا ئێك ئارمانج هەبوو ئەوژی ژ ناڤبرنا دەولەتا ئاشووری بوو. ل دوماهیا سالا ٦١٢ ب.ز پشتی دۆرپێچکرنا باژێرێ (نەینەوا) یا پایتەخت شیان داگیر بکەن، پاشی باژێرێ (ئاشوور) و (نەمرود) ژی داگیرکرن. یا پێدڤی ئاماژەکرنێیە د سەردەمێ ئیمپراتۆریەتا میدیا دا (زەردەشت)ێ پێغەمبەرێ میدیا دەرکەفت و ئایینێ زەردەشتی بەلاڤکر.

## زەردەشت:

زەردەشت ب نڤشێ میدیە، لسالا ٦٦٠ ب.ز ل دەڤەرا (ئەترۆپاتین) ل رۆژئاڤایێ گولا (دەریاچە) ورمێ (ئورمیە) ژ دایك بوویە، ئایینێ زەردەشتی بۆ ئایینێ فەرمیێ دەولەتا میدیا.

## دوماهیا دەولەتا میدیا:

سالێن ٥٥٣ - ٥٥٠ ب.ز لسەردەمێ (ئاستیاك)ێ شاهێ میدیایێ داویێ، فارسێن (هەخامنشی) ب سەرۆکاتیا (کورش)ی سەرهلدان و وەك هێزەکا نوو د دەڤەرێدا پەیدابوون، کورش کەفتە هەڤرکی و ململانێ لگەل میدیا و شیا ب هاریکاریا سەرکردەکێ میدیا بناڤێ (هارپاك) دژی ئاستیاك بکەڤیتە شەری و باژێرێ (ئەکباتانا) داگیربکەت و داویێ ب دەولەتا میدیا بینیت.

## پرسیارێن بەندێ دووێ

پ ١/ ئەڤێن خارێ پێناسە بکە:

( لۆلۆیی ، زاموا ، نەرام سین ، ئارابخا ، نەهارین ، عەقەرقوف ، گاندیش ، دیاکۆ ، هارپاك ، ئاستیاك )

پ٢/ ب کورتی بەرسڤا ڤان پرسیارا بدە:

١- دەربارەی کاشیا ئەڤێن خارێ روون بکە:

أ- جهێ ئاکنجیبوونا وان.

ب- ناڤێ کاشیا ژ چ هاتیە؟

ج- چ ژ عەقەرقوف دزانی باسبکە؟

د- چەوا دەسهەلاتا وان ژ ناف چوو؟

٢- لسەر میتانیا:

أ- باسێ پەیوەندیێن دناڤبەرا میتانیا و ئاشووریادا بکە.

ب- باسێ پەیوەندیێن دناڤبەرا میتانیا و مسریادا بکە.

٣- لسەر دەولەتا ماد ڤان برگا روون بکە.

أ- جه و سنۆرێ ڤێ دەولەتێ دیار بکە.

ب- چاوا ئەڤ دەولەتە ب داوی هات؟

ج- ئایینێ میدیا چ بوو؟

پ٣/ ڤان ڤالاتیا پربکە:

١- لۆلۆیی ئاکنجیبوون ل پشکا ------------- چیایێ زاگرۆس د ناڤبەرا هزارا ------------- بەری زایینێ و دەسهەلاتا وان گەهشتبوو دەڤەرێن ------------- و ------------- .

٢- دەسهەلاتا گۆتیا گەهشته باژێرێن باشوور لسەردەمێ شاه -------------- و دەسەلاتا وان ماوێ -------------- ڤەکێشا.

٣- میتانی ئاکنجیبوون ل پشکا -------------- کوردستانێ پشتی بجه هێلانا چیایێن زاگرۆس.

٤- رۆژهەلاتناس جۆنس دبێژیت پەیڤا میتانی ب رامانا -------------- دهێت بۆ -------------- هاتیه بکارئینان.

٥- کاشیا چەند ناڤەکێن دیتر هەبوون و پێ دهێنه نیاسین وەکی -------------- و -------------- و --------------.

٦- دەولەتا میدیا یا مەزن ل دەوروبەرێن سالا -------------- بەری زایینێ ل پشکا -------------- کوردستانێ هاته دامەزراندن و باژێرێ -------------- کرە پایتەختێ ڤێ دەولەتێ.

# بـەنـدێ سـیـێ

## شوونوارێن دێرینێن کوردستانێ

### کوردستان:

بۆ جارا ئێکێ کو ناڤێ کورد د ژێدەرێن بزماری (مێخی) دا هاتبیت بۆ داویا هزارا سیێ بەری زایینێ ڤەدگەریت دەمێ باسێ جهەکی دکەت ب ناڤێ وەلاتێ کوردا.

بەلێ پەیڤا کوردستان بۆ جارا ئێکێ ل چەرخێ دوازدێ زایینی بکار هاتییە. ئەو ژی ژ دو برگا پێك دهێت: (کورد) کو ئاماژێ ب نەتەوا کورد دکەت و (ستان) ب رامانا ولات یان هەرێم یان جه دهێت. ئانکو کوردستان رامانا (وەلاتێ کوردان) دگەهینیت. ئاخا کوردستانێ وان هەمی دەڤەرا ڤەدگریت یێن دکەڤنە باکورێ چیایێن زاگرۆس، و باکۆر و باکۆرێ رۆژهەلاتێ دۆلا ناڤبەرا دو رووباران (میسۆپۆتامیا) هەتا کەنارێ دەریایا ناڤەراست و رۆژهەلاتێ پانیا ئەنادۆل هەتا بنارێ چیایێ حەمرین.




نەخشێ کەڤنێ کوردستانێ

## گرنگترین شوونوارێن دێرینێن کوردستانێ:

**١- شکەفتا شانەدەر:** مەزنترین و ناڤدارترین شکەفتا کوردستانێ یە دکەڤیتە چیایێ برادوست ل پارێزگەها هەولێرێ. ل سالێن دناڤبەرا ١٩٥١ - ١٩٦١ دا ژ لایێ تیمەکا ئەمریکی ڤە پشکنین لێ هاتیە کرن، دیرۆکا ڤێ شکەفتێ ڤەدگەریتە سەردەمێ دناڤبەرا ٦٠ - ٤٥ هزار سالا دا، مرۆڤێ نیاندرتال ئانکو بۆ قوناغا چەرخێ بەرینیێ کەڤن تێدا ژیایە.



وێنێ شکەفتا شانەدەر

**١- شکەفتا هزار مێرد:** دکەڤیتە دووریا ١٣ کم ل باشوورێ رۆژئاڤایێ سلێمانیێ ل چیایێ بەرانان، ل سالا ١٩٢٨ ز ژ لایێ شوونوارناسەکێ ئەمریکی ڤە پشکنین لێ هاتیە کرن، و دیرۆکا وێ بۆ ٥٠٠٠٠ سالا ڤەدگەریت ئانکو بۆ قۆناغا چەرخێ بەرینیێ کەڤن.

**٣- شکەفتا زەرزی:** دکەڤیتە زنجیرا چیایێ سەرسەرد نێزیك گوندێ زەرزی ل چەمێ رێزان، دیرۆکا وێ بۆ ١٢٠٠٠ دوازدە هزار سالا ڤەدگەریت ئانکو بۆ چەرخێ بەرینیێ کەڤن.

**٤- چەرمۆ:** دکەڤیتە دووراتیا ١١ کم ل رۆژهەلاتێ باژێرێ چەمچەماڵ لسەر چەمێ مەزن کو ئێکە ژ لقێن رووبارێ رۆخانە و تاووغ چای ل پارێزگەها کەرکووکێ. شوونوارێ چەرمۆ کەڤنترین گوندە ل جیهانێ، دیرۆکا وی بۆ چەرخێ بەرینییێ نوو (هزارا حەفتێ بەری زایینێ) ڤەدگەریت.

خەلکێ گوندێ چەرمو تەرش و تەوال کەهی کرن، گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باقلك چاندن و ئامانێت ئاخێ (گلێنە) و خانی دروستکرن. هەروەسا پەیکەرێن خوداوەندان بۆ خۆ دروستکرن ب رەنگەکی کو سەرێن ژ تەقنێ چێکری ئاماژە ب خوداوەندێ دایك دکر.

**٥- میلێ دەربەندێ گاور:** دکەڤیتە ئێك ژ دەربەندێن چیایێ قەرەداغ ل سلێمانیێ نێزیك گوندێ تەکیە و بەلەکجار. ئەڤ میلە یێ د بەرێ دەربەندی هاتیە کولان وێنێ شاهەکی نیشاددەت چێدبیت یێ (نەرامسین) ی بیت، یان یێ (ئانوبانینی) ێ شاهێ لۆلۆیـیا بیت دەمێ سەرکەفتی لسەر دوژمنێن خۆ. هەژی گۆتنێ یە چ نڤیسین لسەر ڤی میلی نینن.



نەخشێ هندەك ژ گرنگترین شوونوارێن کوردستانێ

**٦- میلێ ئانو بانینی:** دکەڤیتە سەر چیایێ بادیر ل دەڤەرا (سەرپێلزهاو) ل رۆژهەلاتێ کوردستانێ. وێنێ شاهێ لۆلۆیی ئانوبانینی نیشا ددەت دەمێ سەرکەفتی لسەر دوژمنێت خۆ، هەروەسا هندەك نڤیسینێت بزماری لسەرن ب زمانێ ئەکەدی باسێ ڤێ رووداێ دکەت.

٧- شکەفتا قزقاپان: دکەڤیتە نێزیك شکەفتا زەرزی ل زنجیرا چیایێن سەرسەرد نێزیك گوندێ زەرزی ل چەمێ رێزان، پێك هاتیە ژ گورەکێ سێ ژووری د بەرێ چیایی هاتیە کولان، پێشیا وی نەخشەکێ لسەر هاتیە کولان دیمەنێ دوو شاها لسەرە د رێورەسمێن ڤەشارتن و بن ئاخ کرنێ دانە. دیروکا ڤی نەخشەی بۆ سەردەمێ ئیمپراتۆریەتا میدیا (٧٠٠ - ٥٥٠ ب.ز) ڤەدگەریت.



وێنێ ژمارە ( ٢٠ ) کیاکسار ل تێکۆلگەها قزقاپان

## پرسیارێن بەندێ سیێ

١- چەرمۆ چیە؟ دکەڤیتە کوودرێ؟ گرنگیا وی د چ دایە؟
٢- شکەفتا هزار مێرد دکەڤیتە کوورێ و گرنگیا وێ د چ دایە؟
٣- گرنگیا دەربەندێ گاور چیە؟
٤- شکەفتا قزقاپان بۆ چ سەردەمەکی ڤەدگەڕیت؟

**چالاکی:**
گرۆپەك ژ قوتابیان ب هاریکاریا مامۆستایێ وانێ... دێ نەخشەکێ دیرۆکی بۆ دەسنیشانکرنا شوونوارا بەرهەڤکەت.

## بەندێ چارێ

## پشکا ئێکێ

### ئیران لسەر دەمێ ئەخمینییا ( هەخامەنشیا )

ل دەوروبەرێن سالا ٨٠٠ ب.ز فارس ژ دەردوٚرێن دەریایا قەزوین هاتن و ل دەڤەرا (پارس) ل باشوورێ ئیرانێ ئاکنجیبوون و بوٚ ماوەیەکێ درێژ ملکەچێن میدیا بوون.

ل داویا سەدێ هەشتێ ب.ز ژ ئەنجامێ هەڤگرتنا هوٚزێن فارسا لسەردەستێ (ئەخمینس) ئێکەمین دەولەتا فارسی هاتە دامەزراندن.

### کوٚرشێ دووێ ٥٥٨ - ٥٣٠ ب.ز:

پشتی شاه قەمبیزی دەسهەلاتا دەولەتا هەخامەنشیا کەفتە دەستێ کورشێ دووێ ل ژێر ناسناڤێ کورشێ مەزن، دوان سالا دا ملکەچێ کیاکسارێ شاهێ میدیا بوویە. بەلێ ل سالا ٥٥٠ ب.ز شیا دژی دەسهەلاتا میدیا راوەستیت و دەولەتا میدییا ژ ناڤ ببەت و ئەکباتانا داگیر بکەت و هەمی گەنجینەیێن وان ب تالان کەت. کوٚرشێ دووێ ب ناڤێ شاهێ میدییا خوٚ دا نیاسین ژ بەر هندێ مسریا و یونانیا بوٚ وی ناسناڤی سەرەدەری د گەلدا کریە.

کریارێن جەنگی یێن کوٚرشێ مەزن گەلەك و گرنگن وەکو ژناڤبرنا دەولەتا میدیا ل سالا ٥٥٠ ب.ز، و ژ ناڤبرنا دەولەتا لیدیا ل ئەنادوٚلێ ل سالا ٥٤٦ ب.ز، داگیرکرنا ئەفغانستانێ و هەردو هەرێمێن (سەیحون و جەیحون) و قەندەهار و هەتا باکورێ روٚژئاڤایێ هندستانێ، پشتی ڤان شەرا کوٚرشی بەرێ خوٚ دا وەلاتێ بابل و شیا شاهێ بابلیا بشکێنیت و بابل داگیرکەت، سالا ٥٣٩ ب.ز خوٚ ب ناسناڤێ شاهێ بابل بناڤکر.

## قەمبیز (کەمبوجیە) ٥٣٠ - ٥٢٢ ب.ز:

قەمبیزێ دووێ سەرکردەکێ مەزنێ هەخامەنشیا بوو ژ بلی چەسپاندنا دەسەلاتا خۆ ب سەر وی ئەردێ لسەردەمێ کۆرشی هاتیە داگیرکرن، هێرش برە سەر وەلاتێ مسرێ، شیا ل سالا ٥٢٥ ب.ز داگیرکەت.

سالا ٥٢٢ ب.ز ل وەلاتێ فارس (باردیا) ێ برایێ قەمبیزی ئاگرێ شورەشا خۆ هەلکر و قەمبیزی ب نەچاری مسر بجه هێلا و بەرەف وەلاتێ فارس ڤەگەریا ڤە، بەلێ دارایێ ئێکێ (داریوشێ ئێکێ) د پیلانەکێدا شیا قەمبیزی ژناڤ ببەت و حوکمێ باردیای ژی دەمەکێ درێژ ڤەنەکێشا.

## دارایێ ئێکێ (داریوشێ ئێکێ) ٥٢٢ - ٤٨٦ ب.ز:

دەسپێکا حوکمێ دارایێ ئێکێ (داریوشێ ئێکێ) یاخیبوون (پشتەرێبوون) و شورەشێن ویلایەتا دەسپێکر ب تایبەتی شورەشێن میدیا و عیلام و بابل. دارای دەست ب هێرشێ کر بۆ سەر بابل و شیا داگیرکەت و دەست ب سەردابگریت و پاشی شورەشێن دی یێن میدیا و عیلام و دەڤەرێن دی بێدەنگ کرن. دارای ئەڤ سەرکەفتنە د چیایێ بیستوون کولان کو دکەڤیتە نێزیك باژێرێ کرماشان ل رۆژهەلاتێ کوردستانێ. هەژی گوتنێ یە شورەشا میدیا (کوردستان) ب سەرکرداتیا فراورتس بوو.



وێنێ فراورتس (ژ چیایێ بێستون هاتیە وەرگرتن)

دارایێ ئێکێ (داریوشێ ئێکێ) د ماوێ ٥١٨ - ٥١٤ ب.ز دا شیا چەند رێکخستنێن کارگێری پەیرەوکەت، وەلاتێ خۆ لسەر (٢٦) ویلایەت (هەرێم) بەلاڤکر کو دگوتنێ (ساتراب) هەروەسا بۆ پاراستنا وەلاتی دەزگەهەکێ تایبەتێ ئاسایشێ دامەزراند و سیستەمەك ژبۆ وەرگرتنا باج و رێکخستنا رێ و رێبارێن بازرگانا دانا، ژ لایێ ئایینێ ڤە رێز ل خوداوەندێ (ئاهورامزدە) دگرت کو وەسا دزانی سەرکەفتنێن وی ب رێیا ڤی خوداوەندی بووینە دڤێرێدا دەردکەڤیت کو دارای ئایینێ زەرەدەشتی پەیرەو کریە.



وێنێ ژمارە ( ٢٣ ) دیوارێ بوستان (چیایێ بێستون)
سەرکەفتنا داریوشی لسەر دوژمنێن وی

## شەرێن یونانیا - ئەخمینیا (٤٩٠ - ٤٨٠ ب.ز):

ئەگەرێن ڤان شەرا ڤەدگەڕنەڤە بۆ داگیرکرنا وەلاتێ یونان ژ لایێ ئەخمینیا (هەخامەنشیا) ڤە و سەرهلدانا یونانیا دەسپێکر ب تایبەتی ل باژێرێ (ئەسینا) کو بیادا سەرهلدانێ دکر. ئەو بۆ چەند شەرەکێن مەزن دناڤبەرا هەردو ئالیاندا روودان. ناڤدارترین شەڕ شەڕێ دەشتا (ماراسۆن) بوو لسالا ٤٨٦ ب.ز کو ب سەرکەفتنا یونانیا و شکەستنا هەخامەنشیا ب داوی هات.

## شاە ئەحشویرشێ ئێکێ ٤٨٦ - ٤٦٥ ب.ز:

ئەرکەکێ مەزن کەفتە سەر ملێن ڤی شاهی ئەوژی بەرهنگار بوونا شورەشا ویلایەتا بوو. شیا ئێکەم جار ل سالا ٤٨٤ - ٤٨٢ ب.ز شورەشا مسریا سەرکوت کەت ب دژوای ل شورەشا خەلکێ بابل دا و باژێرێ بابل کاڤل کر و زەڤورا وی یا ناڤدار وێران کر. ئەحشویرشێ ئێکێ هێزێن خۆ کومکرن بۆ شەرێ یونانیا بەلێ د ڤێ هەوێدا شکەستن ئینا ب تایبەتی د شەرێ (بلاتیە) دا.

## شاه ئەرتحشتایێ دووێ ٤٠٤ - ٣٥٩ ب.ز:

ئەرتحشتایێ دووێ ل وێ رۆ ژا کو دەسهەلات ل پەرستگەها باژێری (بازرگادە) وەرگرتی ژ لایێ برایێ وی یێ بچووك ڤە کو ناڤێ وی کورش بوو هێرش کرە سەر بەلێ هێرشا وی شکەستن ئینا، هەر چەندە بریارا لێبۆرینێ ژی بۆ دەرئێخست بەلێ ئەوێ رژد بوو لسەر دژایەتیا خۆ، ئەو بوو و جارەکا دی کورشی ب هاریکاریا گریکی (یونانی) بانگەوازا شورەشێ دا کو ب هەوا دەه هزار سیارێن یونانی بەرنیاسە ب سەروکاتیا (زەینەفون) ی. ئەرتحشتا شیا لسەر ڤێ شورەشێ سەرکەڤیت و کورشێ برایێ خۆ بکوژیت.

بڤی رەنگی لەشکەرێ زینەفونی پشتی ب داوی هاتنا کارێ وان ل سالا ٤٠١ – ٤٠٠ ب.ز د کوردستانێ را زڤرینە ڤە بۆ یونانێ، د رێدا تووشی بەرگرێ و راهێلانێن کوردا بوون (کو زەینەفونی د کتێبا خۆ ئەناباسیس دا ب کاردوخی ناڤ کرینە) هەژی گۆتنێ یە کو شاهێ داویێ یێ هەخامەنشیا داریوشێ سیێ بوو کو ل سالا ٣٣١ ب.ز د شەرێ کوگمێلا (ئەربێلا) دا نێزیك هەولێرا نهو ل بەرامبەر لەشکرێ ئەسکەندەرێ مەکدونی شکەست، بڤی رەنگی دەولەتا هەخامەنشی ژناڤچوو و تەڤایا ئەردێ ئەنادۆل و شام و مسر و کوردستان و عێراق و ئیران بوونە پشکەك ژ ئیمپەراتۆریەتا ئەسکەندەرێ مەکدونی، هەر چەندە دەڤەرا میدیا (کوردستان) پشتی شکەستنا داریوشی سەربەخۆیا خۆ بۆ ماوەیەکی ل ژێر سەرکرداتیا (ئەتروبات = ئەتروباتکان) راگەهاند. ل سالا ٣٢٣ ب.ز ئەسکەندەر ل باژێرێ بابل دمریت و د ئەنجامدا ئەمپەراتۆریا ئەسکەندەری ل ناڤ بەرا سەرلەشکرێن وی

دا هاتە لێکڤەکرن، ئەنادۆڵ و شام و کوردستان و عێراق و ئیران ب بەر (سلوقس) کەفتن و ئێدی ئەڤ سەردەمە ب سەردەمێ (سلوقی) دهێتە ناڤکرن، مسر ژی ببەر (بەتلیموس) ی دکەڤیت و ئێدی ئەڤ سەردەمەژی ب سەردەمێ (بەتالیسە) دهێتە ناڤکرن.

## راهێنان

١- ئەو فارسێن کو د دەڤەرا (پارس) دا خۆجهبوون، دەمەکێ زوور ملکەچێن:

گریگ (یونانی) یان، میدیان، حیسیان: بوون

٢- د مێژوویا کەڤن دا (شەر) کرن سیمایێ سەروکێ ڤێ پەیوەندیێن نیڤ دەولەتی بوو...

ئەرێ نهو سیمایێ سەرۆکێ سەرەکیێ ڤێ پەیوەندیا نێڤ دەولەتی چیە؟

تەوەرەك بۆ گەنگەشێ

## پشکا دووێ
## ئیران لسەر دەمێ فورثیا ( ئەشکانیا )

ل دەوروبەرێن سالا ٢٥٠ - ٢٤٧ ب.ز دنێڤ وان هۆزێن ل وەلاٚتێ (بارثوا) ئاكنجبووین دا، دوو برایێن سەركردە دەركەفتن ب ناڤێ (تیریداتس) و (ئەرشاك) كو شیان د شەرەكێ خیناویدا دژی (سلوقیا) ل هەرێما (پارپوا)كو (ئەرشاك) تێدا هاتە كوشتن سەركەفتنێ بدەستڤەبینن، شاهێ ئەشكانیا شیا هەرێما خوراسان و چەند هەرێمێن دەوروبەرێن گولاٚ قەزوین داگیركەت، ژ بەر بەرفرەهبوون و مەزنیا ئیمبراتوریەتا ئەشكانی دو پایتەخت بو خو دروستكرن، یێ ئێكێ (ئەكباتانا) یا میدیا بوو كو پایتەختێ وان یێ هاڤینێ بوو، یێ دووێ (تەیسەفون) لسەر بەشێ روژهەلاتێ رووبارێ دیجلە، پایتەختێ وان یێ زڤستانێ بوو.

### شاه متریداتسێ ئێكێ ١٦٠ -١٤٠ ب. ز:

دەسهەلاتا دەولەتا ئەشكانیالسەردەمێ شاه متریداتسی پتر جێگیربوو، ب رەنگەكی وەلاٚتێ میدیا و فارس و هەرێما ئارامیا و ئاشوریا ب خوڤە گرتن، ئەشكانیا دڤی سەردەمیدا باژێرێ (تەیسەفون) (تاقێ كیسرای - سەلمان پاكا نهو ل نێزیك باژێرێ بەغدا) دروستكر، قریداتسێ ئێكێ كو ب دامەزرێنەرێ ئیمبراتوریەتا ئەشكانی دهێتە هژمارتن ناسناڤێ (شاهێ شاها) بو خو هەلبژارت، و ژبو رازیكرنا یونانیان خو ب ناسناڤێ (هیلینان) ژی.

## شەڕێ د ناڤبەرا سلوقیا و ئەشکانیادا:

بزاڤێن سلوقی ژ بو رزگاربوونێ ژبن دەسهەلاتا ئەشکانیا د بەردەوام بوون، ئەوبوو لسەر دەمێ شاهێ سلوقیا (ئەنتیوخسێ حەفتێ) و هەوەکا لەشکری بەرهەڤکر بۆ سەر هەرێمێن رۆژهەلاتی و شیان د سێ شەڕاندا بسەر ئەشکانیاندا سەرکەڤن و باژێرێ (ئەکباتانا) داگیرکەن.

## فراهاتس:

دەمێ فراهاتس هاتیە سەر تەختێ شاهاتیا ئەشکانیا، داخاز ژ سلوقیا کر کو پەیمانەکا ئاشتییێ گرێدەن، بەلێ سلوقی رازی نەبوون، ژبەر هندێ فراهاتسی خەلکێ باژێرێن خۆ پالدان دژی سلوقیا شورەشا بکەن ، وی ب خۆ ژی ب لەشکرەکێ بهێزڤە هێرش کرە سەر ناڤەندا دەسهەلاتا (ئەنتیوخسی) و شیا دڤی شەڕیدا بکوژیت و ژمارەکا زۆرا سەربازێن وی ب ئێخسیری بگریت. بڤێ چەندێ ل سالا ١٢٩ ب.ز سلوقی کەفتنە مەترسیا ژناڤچوونێ ل رۆژهەلاتی مەترسیا ئەشکانیابول رۆژئاڤای مەترسیا رۆمانیا:

## متریداتسێ دووێ ١٢٣ - ٨٨ ب.ز:

دەولەتا ئەشکانی ل دەڤەرێن رۆژهەلاتێ بەرهنگاری هێرشا هۆزێن (ساکا) بوون، ئەڤ هۆزێن کوچەران رژیانە وەلاتێ ئیرانێ و د زنجیرەکا شەڕاندا ئەشکانی شکاندن و شاه (فراهاتس) کوشت.

ل سالا ١٢٣ ب.ز شاهەکێ بهێز ب ناڤێ (متریداتسێ دووێ) دەرکەفت و سەلماند کو سەرکردەکێ بهێز و مەزنە، شیا هەمی مەترسیێن

هوزێن (ساکا) نەهێلیت و تەڤ ویلایەتا بزڤرینتە ژێر دەسهەلاتا خۆ. پشتی هنگێ خۆ بۆ کارێ ئاشتیێ و پەیوەندیێن بازرگانی لگەل چینیا تەرخانکر.

## شەڕێن دناڤبەرا ئەشکانیا رۆمانیا

**ئێك:**

کەڤنترین پەیوەندیێن دناڤبەرا ئەشکانی و رۆمانیا ڤەدگەڕنە سەردەمێ مترێداتسێ ئێکێ، کو ل سالا ۹۲ ب.ز داخازا گرێدانا پەیمانەکا ئاشتیێ دگەلدا کر، بەلێ رۆمانی رازی نەبوون و ب سەرکرداتیا (سلا) هێرش کرە سەر شاهنشینا ئەرمەنی، مترێداتسی شاندەك هنارت بۆ گەنگەشەکرنا ئاشتیێ بەلێ (سلا) ب ڤێ چەندێ رازی نەبوو، ژبەر هندێ شەڕ د ناڤبەرا واندا پەیدابوو، د زنجیرەکا شەڕ و پێکدادانادا رۆمانی شکەستن و نەچار لسەر دەمێ فراهاتسێ سیێ ل سالا ۷٦ – ۷۰ ب.ز داخازا پەیمانەکا ئاشتیێ کر.

**دوو:**

پشتی کوشتنا فراهاتسێ سیێ ئاژاوە دناڤ دەولەتا ئەشکانیا و ب تایبەتی دنێڤ بنەمالا دەسهەلاتدار دا پەیدابوو، رۆمانیا ئەڤە ب دەلیڤە زانی و ب سەرکرداتیا (کراسوس) ی شەڕ دژی ئەشکانیا کر، ئەو بوو ل سالا ٥۷ ب.ز شەڕێ خووناویێ (حەران) ل باکوورێ رۆژئاڤایێ کوردستانێ روودا و رۆمانی شکەستن و کراسوس ژی هاتە کوشتن.

## سێ:

رۆمانی ب سەرکرداتیا (کاسیوس)ی شیان پایتەختێ ئەشکانیا (تەیسەفۆن) داگیرکەن، هەروەسا هێرش کرە سەر باژێرێ (الحچر) و داگیر کر: دژوارترین سەردەمێ بەختەرەشیا یێ ئەشکانیا لسەر دەمێ ئیمپراتۆرێ رۆمانی (کراکلا)ی بوو، ڤی سەرکردەی ب داڤدۆزی وەسا خۆ دیار کر کو دڤێت پەیمانا ئاشتییێ دگەل واندا مۆر کەت ژ بەر هندێ ئاکنجیێن (تەیسەفون) دەرگەهێن باژێرێ خۆ بۆ ڤەکرن و ژێ پشت راست بوون، بەلێ کراکلای ب هۆڤاتی هێرش کرە سەر و هژمارەکا بێ سنوور ژ خەلکی کۆشتن. بەلێ ئەو ژی گەهشتە سزایێ خۆ و ب نهێنی هاتە تیرۆرکرن.

## چار:

شەرێ داویێ دناڤ بەرا رۆمانیا و ئەشکانیادا شەرێ (نوسەیبین) بوو ل باکوورێ رۆژئاڤایێ کوردستانێ کو ئەنجامێ ڤی شەری ب مۆرکرنا پەیمانا ئاشتییێ ب داوی هات. ب ڤی رەنگی شەرێ دناڤبەرا هەردو لایادا کو نێزیکی دوسەدەیا ڤەکێشا ژبلی کاڤلکرن و وێرانکرنێ چ لایەك یێ سەرکەفتی نەبوو.

## داویا دەسهەلاتا ئەشکانیا:

ئەگەرێ سەرەکییێ شەرێ دوورودرێژێ دووسەدەیا دناڤبەرا رۆمانیا و ئەشکانیا دا لاوازیا دەولەتا ئەشکانی بوو. بەلێ پشتەرێبوون و شۆرەشێن ویلایەت و مێرگەهان ژی زۆر دکاریگەربوون. ب تایبەتی شۆرەشا هەرێما فارس ب سەرکرداتیا ئەردەشێرێ کورێ بابك کورێ ساسان کو شیا سەرکەفتنێ بدەستڤە بینیت و دەولەتا ساسانی دامەزرینیت.

# پشكا سيێ
# ئيران لسەردەمێ ساسانيا

ساسانى ب ناڤێ (ساسان) باپيرێ (ئەردەشێر)ى هاتينە ناڤكرن ل باژێرێ (ئەستەخر)ێ هەرێما فارس كو كەسەكێ زانا و ئاينى بوو.
ئەردەشێرى پشتى مرنا (بابك)ێ بابێ خوٚ دەسهەلات وەرگرت، ل شەرێ داويێ د ناڤبەرا شاهێ ئەشكانيا و ئەردەشێريدا ئەردەشێر بسەركەفت.
ل سالا ٢٢٤ ز (مەدائن)ا پايتەختێ ئەشكانيا داگيركر و ل وێرێ خوٚ كرە ميراتگرێ ئەشكانيا و دانان و حوكمداريا بنەمالەكا نوو ب ناڤێ ساسانيا ئاشكرا كر و خوٚ ب ناسناڤێ (شاهێ شاها) بناڤكر. ئەردەشێرى د زنجيرەكا شەڕ و پێكدادانا دا دەسهەلاتا خوٚ بنەجه كر و شيا هەرێمێن ميديا و ئەرمينيا و ئەڤغانستان و بلوجستان و بابل داگيركەت.

## شاپوورێ ئێكێ ٢٤٢ - ٢٧٢ ز:

دەمێ شاپوور هاتيە سەر حوكمى تووشى شورەشا ئەرمينيا و (الحضر) بوويە شاپوور شيا پشتى چار سالا ب سەر ڤان شورەشاندا سەركەڤيت.
مەزنترين گەفا كو شاپوورى هزر بوٚ دكر ترسا بيزەنتيا بوو.
پشتى كاودانێن وەلاتى ئارام بووين، شاپوورى لەشكرەكێ بهێز دژى بيزەنتيا بەرهەڤكر و بەرەف سوريا هنارت و پرانيا باژێرێن وێ داگيركرن هەتا گەهشتيە (ئەنتاكيا)، بيزەنتيا نەچار پەيمانا ئاشتيێ ب مەرجێن شاپوورى موٚركر. پشتى چەند سالەكا شەڕەكێ نوو دناڤ بەرا واندا روو دا و ديسا بيزەنتى تێدا شكەستن و حەفتێ هزار

ئێخسیر ژێ هاتنە گرتن و رەوانەی باژێرێ شاپوور هاتنە کرن و ل وێرێ بەنداڤەکا مەزن پێ دروست کر ب ناڤێ بەنداڤا ئیمبراتۆری.

## شاپوورێ دووێ ٣١٠ - ٣٧٩ ز:

شابوورێ دووێ درێژترین ماوەی حوکم د دەستدا بوو کو نێزیکی حەفتێ سالا ڤەکێشایە، ڤی شاهی د وی ماوێ دوور و درێژ دا گەلەك کارێن گرنگ بدەست ڤە ئینان.

## ئێك: کارێن وی دنێڤ ولاتیدا:

١- کێمکرنا دەسهەلاتا خانەدانا، کو ڤان دەسهەلاتەکا زۆر هەبوویە و سامانەکێ زۆر پەیدا کریە، شاپووری دەسهەلاتا خانەدانا کێم کر و ب هیچ رەنگەکی رێ نەدایێ مایێ خۆ د کاروبارێن دەولەتێدا بکەن.

٢- رێکخستنا کاروبارێن کارگێری و ئابووری.

## دو: کارێن وی یێن ژدەرڤە:

١- شەرێن وی لگەل هۆزێن (هۆن) ل وەلاتێ چینێ کو پشتی هنگێ پەیمانا ئاشتیێ لگەل گرێدا و پرانیا وان هاتنە ژێر دەسهەلاتا وی.

٢- سالا ٣٥٩ ز شیا هێرشێ بکەتە سەر کەلا (ئامەد - دیاربەکر) و ژبن دەستێ بیزەنتیا رزگارکەت.

٣- عەرەبێن هەرێما (بەحرەین)ێ شکاندن.

٤- داوی شەرێ شاپووری لگەل بیزەنتیا پشتی بەلاڤبوونا ئاینێ مسیحی بوو، کو ئەڤ ئاینە بۆ ئاینێ فەرمیێ بیزەنتیا، و د ئەنجامدا شەر و جەنگێ دناڤبەرا واندا ب پەیمانا ئاشتیێ بداوی هات.

## کیسرا ئەنوشێروان:

سەردەمێ کیسرایێ ئێکێ کو ب ئەنوشێروان بەرنیاسە ب گەشترین سەردەمێ دەولەتا ساسانی دهێتە هژمارتن. کیسرا ئەنوشێروان ددەمێ دەسهەلاتا خۆدا شیا خزمەتەکا مەزن بگەهینیتە خەلکێ ئیرانێ د تەڤ بیاڤێن ژیانێدا، ئەڤە ژبلی وێ کو دەسهەلاتا ساسانیا گەهاندە (یەمەن)ێ.

## چاکسازیێن کیسرا ئەنوشێروان

### ١- ژ روویێ جڤاکی ڤە:

میرێن ویلایەتێن خۆ ئاگەهدارکرن کو هیچ کارەك بێی پرسا دەسهەلاتا ناڤەندێ ناهێتە کرن ئانکو مەرکەزیەت پەیرەوکر، پشتی گەندەلیا جڤاکی چارەسەرکری کو پشتەڤانێن (مەزدەك) دروستکربوو، مال و ئەرد بۆ خودانێن وان زڤراندن، و گۆنەهبار ژی گەهاندنە سزایێن وان.

### ٢- د بیاڤێ ئابووریدا:

د ڤی بیاڤیدا کیسرای فەرماندا وان گوند و رێ و پر و جۆئاڤێن کو خودانێن وان نەشیابوون بپارێزین ژبەر وێ گەندەلیا پشتەڤانێن (مەزدەك) دروست کری نوژەن و ئاڤەدان کەتەڤە، هەروەسا یاسایا باجێ سەروژنوو ب رەنگەکێ گونجای دانا ڤە.

ژ گرنگترین پاشمایێن وی ژی (دیوارێ کیسرا) ل (مەدائین) کو هەتا نهو ل ژێریا بەغدا یا ئەڤرۆ مایە.



وێنێ دیوارێ کیسرای ل مەدائین

## ئەگەرێن هەرفاندنا دەولەتا ساسانی:

١- هەڤرکی و ململانا دناڤبەرا بنەمالێن حوکمدار و نەمانا سەرروەریا شاهان.

٢- هەڤرکی و ململانا دناڤبەرا ئایناندا ب تایبەتی دناڤبەرا ئاینێ زەردەشتی دگەل ئاینێن دیتر وەك جوهی و مەسیحی ژ لایەکی ڤە، مەزدەکی و مانەوی ژ لایەکێ دیتر ڤە.

٣- دەسهەلاتا نەجیب زادە و دەرەبەگان کو پەیرەوێ مەرکەزی نەدکر.

٤- زۆربوونا باجێ لسەر ئاکنجیا، بۆ ئەگەرێ نەرازیبوونەکا زۆر دنێڤ تەخێن جودا جودا دا.

٥- زنجیرا شەرێن وان لگەل پرانیا نەتەوێن هەڤسووی وەك بیزەنتي و ئەرمەني و تورك و عەرەبان.

## بەندێ پێنجێ
## مێژوویا کەڤنا دۆلا نیل (مسر)

وەلاتێ مسرێ دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ کێشوەرێ ئەفریقیا. و دکەڤیتە سەر دو دەریایێن گرنگ ئێك ژ وانا دەریایا سپی یا ناڤەراستە (رۆم) ژ باکووری ڤە و یادیتر دەریایا سۆر (قەلزەم)ە ژ رۆژهەلاتی ڤە. پشکا باشوورێ مسرێ پێکهاتیە ژ وەلاتێ سودانێ و بڤی رەنگی ژی هەرسێ کیشوەرێن جیهانێ (ئاسیا و ئەفریقیا و ئەوروپا) دگەهیتە ئێك و هەر د سەردەمێن کەڤندا رێیا سەرەکیا ڤێ پێك گەهاندنێ بوویە. دەربازبوونا رووبارێ نیل د مسرێدا دەربازبووی گرنگیەکا دیتر ب ڤی وەلاتی بەحسێ هەر وەك مەزنە دیرۆك نڤیسەکێ وەکی هێرۆدۆتس دبێژیت (مسر خوداپێدایا نیلە).

### چەرخێن بەری مێژوویێ:

چەرخێن بەری مێژوویێ لسەر روویێ ئەردی پشکەکا زۆرا مێژوویا مرۆڤایەتیێ پێکدئینن، ل مسرێ ژی وەك وەلاتێن دیتر لگەل پەیدابوونا ئێکەم مرۆڤ د دەڤەرێدا دەسپێدکەت کو ڤەدگەریتە هزاران سالان بەری زاینێ هەتا دەمێ داهێنانا نڤیسینا هێرۆگلیفی ل (٣١٠٠ ب.ز)، بەلێ دەربارەی وی ماوەی پێزانین د کێمن ژبەر هندێ ژبۆ ب دەستڤەئینانا پێزانینا پشت ب شوونوار و کەل و پەل و پاشماوان دهێتە بەستن. ژڤان ژی ب تایبەتی ئامانێن ئاخێ (گلێنەسازی)، مرۆڤ د ڤی سەردەمیدا د ژیانەکا سادە و ساناهیدا ژیایە (بەر) بۆ دروستکرنا کەل و پەلێن ژیانا خۆ یا رۆژانە بکارئینایە و ل داویا سەردەمێن دیدا بکارئینایە.
ب رەنگەکێ گشتی چەرخێن بەری مێژوویێ لسەر ڤان پشکێن خارێ دهێنە دابەشکرن.

**ئێك:** چەرخێ بەرینیێ کەڤن (ڤەدگەریتەڤە بۆ هەتا دەوروبەرێن نێزیکی ٨٠٠٠ ب.ز):

دڤی چەرخیدا تەڤ پێداویستیێن ژیانا خۆ ژ بەری دروستکرینە، ژبەرهندێ دبێژنێ (چەرخێ بەری) ئەڤە ژبلی بکارئینانا دار و هەستیکێن ئاژەلا.

## گرنگترین ساخلەتێن ڤی چەرخی:

١- تەڤ پێداویستێن خۆ ژ بەری دروستکرینە وەك: چەقو، تیر، ... هتد.

٢- ستوونا سەرەکیا ژیانا وان پێکهاتبوو ژ راڤ و نێچیرا گیانەوەرێن کووڤی و کۆمکرنا خوارنێ.

٣- جهەکێ تایبەت و دیارکری نەبوویە ژ بۆ ئاکنجیبوونێ.




دۆلا نیل (مسر)

**دو:** چەرخێ بەرینییێ ناڤەراست:

سەبارەت ڤی چەرخی شوونوار ل مسرێ زۆر د کێمن و پێزانین ژی دەربارەی وان دکێمن تنێ ل دەڤەرا (حەلوان) نێزیك قاهیرە نەبیت کو چەند شوونوارێن کێم تێدا هاتینە ڤە دیتن، د ڤی چەرخیدا ئەو کەل و پەلێن کو ژ بەری دهاتنە دروستکرن ژ لایێ قەبارەی ڤە دمەزن بوون.

**سێ:** چەرخێ بەرینییێ نوو:

د چەرخێ بەرینییێ نوو دا کۆمەکا گۆرانکاریان روودایە، کو د چەرخێن دیترێن بەری خۆدا نەبووینە ژ بەر هندێ ئەڤ سەردەمە ب سەردەمەکێ گرنگ دهێتە هژمارتن، ئەڤەژی ژ بەر ڤەدیتنا چاندنێ د ڤی سەردەمیدا و هەروەسا فێربوونا خودانکرنا ئاژەلان و کەهیکرنا وان و دروستکرنا خانیان و ئاکنجیبوونێ و چێکرنا ئامانێن ئاخێ (گلینە) و دروستکرنا جل و بەرگان و هەلگرتنا چەکی ژ بۆ خۆ پاراستنێ ژ سیمایێن دیارێن ڤی سەردەمینە.

**چار:** چەرخێ بەرینییێ کانزایی (٣٨٠٠ - ٣٢٠٠ ب.ز)

ئەڤ چەرخە ژ تەڤ چەرخێن بەری خۆ پێشکەفتیتر بوویە کو دبێژنێ سەردەمێ بەری شارستانیەتێ یان سەردەمێ دەسپێکا شارستانیەتێ، ئەڤەژی ژ ئەگەرێ بکارئینانا کانزای د چێکرنا کەل و پەل و پێداویستێن خۆ یێن ژیانا رۆژانەدا ل

## گرنگترین ساخلەتێن ڤی چەرخی ژی پێکهاتبوون ژ:

١- بکارئینانا کانزایێ (سفر و برونزی).

٢- بکارئینانا بەری د بیاڤێ جوانکاریێدا وەکی رستك و بازن و... هتد

٣- بەرفرەهبوونا بیاڤێ چاندنێ.

٤- بەرفرەهبوونا قەبارێ گوندان و رێکخستنا وان ب رەنگەکێ رێك و پێك.

٥- پێشکەفتنا ئامانێن ئاخێ ب تایبەتی ئامانێن رەنگاورەنگ، کو ب شێوازەکێ هونەریێ جوان هاتبوونە دروستکرن.

٦- ل داویا ڤی سەردەمی پەیوەندی لگەل دەرڤە پەیدا بووینە.

## چەرخێن مێژوویی:



وێنێ ژمارە ( ٢٤ )
پەیکەرێ شاه (تۆتۆمێ سیێ)

بەری دروستبوونا دەسهەلاتا سیاسیا بنەمالاْن، وەلاْتێ مسرێ ب سەر چەند یەکەیێن سەربخۆ یان دەولەتکێن بچووك بچووکدا دابەش ببووچ ل باکووری و چ ل باشووری ...، هەر ئێك ژ ڤان دەولەتکا ژی خوداوەندێ تایبەتمەندێ خۆ هەبوو، هەتا د سەر دەمێ شاه (مینا)ی دا کو شیا دەولەتەکا ئێکگرتی دامەزرینیت، کو پایتەختێ وێ باژێرێ (مەنفیس) بیت و نێزیکی (٣١) بنەمالاْ تێدا حوکمی بکەن.

## مێژوویا چەرخێن کەڤن ل مسرێ بۆ چەند سەردەمان دهێتە دابەشکرن ئەوژی:

## ئێك: سەردەمێ کەڤن:

ئەڤ سەردەمە ژی ل گۆر ماوەیێن مێژوویی بۆ چەند سەردەمەکێن دی دهێتە دابەشکرن ژ وان سەردەمێ دەسپێکا دەسهەلاتا بنەمالاْن کو بنەمالاْ ئێکێ و دووێ ڤەدگریت و ل سالا (٣١٠٠ ب.ز) حوکمێ شاه (مینا)ی دەسپێدکەت و باژێرێ (مەنفیس) دکەنە پایتەختێ خۆ،

کو د هندەك ژێدەرێن مێژوویدا دگۆتنە ڤی باژێری (تەرازیا ئەردی)، ئەڤەژی ژ بەر وێ چەندێ کو ئەگەر بارودۆخ ل وێرێ یێ ئارام نەبایە دا ل دەڤەرێن دیتر ژی دا بیتە نەئارامی. شاه و مەلیکێن ڤی چەرخی خۆ ب چەندین ناڤ و ناسناڤان دایە نیاسین وەك (شاهێ سەر و بنێن مسری) یان (باکوور و باشوور).

پشتی ڤان سەردەمێ هەرەمان دهێت کو بنەمالا سیێ هەتا شەشێ ڤەدگەریت، شاهێن ڤی سەردەمی چەندین هەرەمێن مەزن و ناڤدار دروستکرینە، ئێکەمین هەرەم ژ لایێ (زۆسەر)ی ڤە ل دەڤەرا (صەقارە) ب رەنگێ پیلیسکەیی (مدرج) هاتیە دروستکرن کو ژ (٦) قاتا پێك دهێت.



وێنێ ژمارە ( ٢٥ ) هەرەمێ پیلیسکەیی (مدرج)

هەروەسا لسەر دەمێ بنەمالا چارێ ژ لایێ شاه (خوفو) ڤە پایتەخت بۆ دەڤەرا (جیزە) هاتە ڤەگوهاستن و هەرەمەك تێدا دروستکر. کو کوچکەکا بەرینیێ مەزنە و بناغەکێ چارگوشەیی هەیە و شێوێ وێ هەرەمیە و لایێن وێ سێگۆشەینە. ئەو کەڤر و بەرێن هەرەم ژێ هاتیە دروستکرن. ب شێوێ چارگۆشەیی هاتیە تراشین و سەنگا هەر بەرەکی نێزیکی دو تەن و نیڤایە و درێژیا بناغێ چارگوشا وێ نێزیك

(٧٥٥) پێیایە بلنداهیا وێ (١٣٩ - ١٤٠) مەترە، نێزیکی دو ملیون و سێ سەد هزار بەرێن تێدا هاتینە بکارئینان و ماوێ (٢٠) سالا ڤەکێشایە و رۆژانە (١٠٠) هزار پالا کار تێدا کریە، لگەل ڤێ هەرەمێ هژمارەکا ژوران ل دەوروبەرێن هەرەمێ هەنە، کو ئەڤەژی د تایبەت بوون بۆ زەلامێن ئاینی و قوربانی کرن و... هتد.

هەروەسا شاە (خەفرەع) کو ب (فیرعەون) هاتیە ناڤکرن، ب رامانا (مالا مەزن)، ڤی شاهی ژی وەکی بابێ خۆ ل (جیزە) هەرەمەك دروستکر دگەلدا ژی پەیکەرەك دروستکر کو نهۆ ب (ابو الهول) بەرنیاسە، ئەڤ پەیکەرە پێکهاتیە ژ سەرێ مرۆڤەکی لسەر کەلەخێ شێرەکی، کو ئەڤە شاە (خەفرەع) نیشا ددەت.



وێنێ ژمارە (٢٦)

لگەل ڤان ژی پەرستگەهەکا مەزن دروستکر کو ب (معبد الوادی) دهێتە نیاسین، هەرەمێ مەزنێ سیێ ژی هەرەمێ شاە (مەنکورەع) بوو ب رەخ هەردو هەرەمێن دیتر ڤە، هەر دڤی سەردەمیدا چەند هەرەمەکێن بچووکتر هاتینە دروستکرن وەك (صەقارە و ئەبوصیر و ... هتد) ژ لایێ بیرو باوەرا ژی ڤە د ڤی سەردەمیدا واز ل پەرستنا فیرعەونی ئینایە و پەرستنا خوداوەندێ (رەع) دەسپێدکەت، ژبەر هندێ پتر گرنگی ب پەرستگەها هاتیەدان و زێدەباری وێ چەندێ کو دروستکرنا هەرەما د ڤێ قۆناغا مێژوویدا رامانا پێشکەفتنا هونەرێ تەلار سازی و بلندبوونا ئاستێ ژیارێ و ئارامیێ و ئاسایشێ دگەهینیت.



ویێنێ ژمارە ( ٢٧ )
سێ هەرەمێن مەزنێن فیرعەونی
خۆفو، خەفرەع، مەنكورەع

## هۆكارێن دروستكرنا هەرەما :

١- هوكارێ ئاینی، مسرییێن كەڤن باوەری ب ساخبوون و ژیانا پشتی مرنێ هەبوو، وەسا هزر دكر كو مرۆڤ ژ دو پشكا پێكهاتیە (كەلەخ و گیان)، دەمێ گیان ژ كەلەخی دەردكەڤیت جارەكا دی بۆ دزڤریتەڤە و ساخ دبیتە ڤە و دچیتە ئاسمانی، ژبەر هندێ پێدڤیە جهەك هەبیت بۆ پاراستنا كەلەخی ژ تێكچوون و خراپبوونێ.

٢- مسرییێن كەڤن چەندین خۆداوەند پەرستینە، ژ وان خوداوەندێ رۆژێ، كو ب هزرا وان ئەردی و ئاسمانی رۆن دكەت، ژ بەر هندێ چەندین پەیكەر بۆ دروستكربوون، هەروەسا چەڤەنگەك بۆ دانا بوو، كو ئەو ژی (رەع) بوو، خوداوەندێ دووێ (نیل) بوو، باوەریا وان وەسا بوو، كو ژیانێ لسەر ئەردی دروستدكەت یان ڤەدژینیت، ژ بەر هندێ هەرەم بۆ دروستكربوو.

٣- هەروەسا هەبوونا بەران ل دەڤەرا (صوان) ل باشوورێ مسرێ و ل دەڤەرا (جبل المقگم) ل رۆژهەلاتێ بیابانا (سینا) هاریکارەکێ باش بوویە بۆ دروستکرنا هەرەمان.

٤- هەروەسا ژ بۆ پاراستنا سنوورێ وەلاتێ خۆ ژ داگیرکرنێ ژلایەکی ڤە و ژبۆ بەرفرەهکرنا سنۆرێ بنەمالا خۆ ژ لایەکێ دیترڤە.

٥- پێشکەفتنا بیاڤێ تەلارسازی و پەیکەرتاشێ د وی سەردەمیدا، دەرکەفتنا کەسەکێ لێزان و شارەزاییێ وەك (ئەمنۆحوتب)ی، کو ب ئەندازیارێ بیاڤێ تەلارسازییێ دهێتە هژمارتن.

٦- دەرکەفتنا ئێکەم فیرعەونێ بهێز ب ناڤێ (زۆسەر)ی د وی سەردەمیدا کو خەلکی گەلەك حەژێ دکر لەورا بزاڤ کر هەرەمێ بۆ دروستکەن و ژ ڤێرێ وێڤە دروستکرنا هەرەمان بوو رەوشت و تیتالەك کو فیرعەونێن پشتی وی لسەر بچن.

٧- پەیدابوونا کەل و پەلێن کانزایێن بهێزێن وەسا، کو بۆ برینا بەرا دهاتنە بکارئینان.

٨- دروستکرنا ڤان هەرەمان پێناسەك بوو بۆ نیشادانا ئێکەتیا سیاسیا وەلاتی.

## سەردەمێ ڤەگوهاستنێ:

سەردەمێ ماقیل و خانەدان و دەرەبەگان (ئاژوا ئێکێ) دڤی سەردەمیدا چار بنەمالا حوکم کریە ئەوژی بنەمالێن (حەفتێ هەتا دەهێ) نە گرنگترین خەسلەتێن ڤی سەردەمی پێکهاتینە ژ:

١- بارودۆخێ وەلاتی ب رەنگەکێ گشتی د تەڤ بیاڤێن ئابووری و سیاسی و جڤاکی و ... هتد و گەلەك خرابوون.

٢- دەستەلاتا مەرکەزی گەلەك لاواز بوو ئەڤە ژی ژ ئەگەرێ بهێز بوونا دەسهەلاتا هەرێمان.

٣- هەبوونا شەڕ و هەڤرکیا هەرێمان ب مەرەما بەرفرەهکرنا دەسهەلاتا خۆ.

٤- نەمانا بزاڤ و چالاکیێن ئابووری وەك پەیوەندیێن ئابووری و بازرگانی لگەل دەڤەرێن دەوروبەر، و ل ناڤخۆ ژی هیچ بزاڤ و لڤینەکا ئاڤەدانیێ وەك دروستکرنا پەرستگەهان و هەرەمان و کوچك و تەلاران نەبوون ژبەر تێکچوونا بارێ ئابووری.

٥- نەبوونا پێزانینان لدۆر مێژوویا وان بنەمالان چونکە بەلگەناما باس نەکریە.

## چەرخێن ناڤەراست ( هکسۆسا ):

سەردەمێ بنەمالێن (یازدێ و دوازدێ) د دیرۆکا کەڤنا مسرێدا ب سەردەمەکێ گرنگ دهێتە هژمارتن چونکە ساخبوونا وەلاتی و زڤراندنا هێز و شیانا بوو بۆ سەردەمێن پێشیێ، دڤی سەردەمیدا ل باژێرێ (گیبە) بنەمالەکا ب هێزا وەسا دەرکەفتن کو دەسهەلاتا خۆ ب سەر هەرێمێن دەوروبەرێن خۆدا سەپاند و رۆلەکێ مەزن د ئێککگرتنا وەلاتێ مسرێدا دیت. لسەردەمێ واندا وەلاتی د بیاڤێ سیاسی و ئابووری و

پەیوەندیێن بازرگانیدا لگەل دەڤەرێن دەوروبەر ڤەژاندن بخوڤە دیت، د ناڤخۆیا وڵاتیدا گرنگی ب کاروبارێن کارگێری و رێڤەبرنێ هاتە دان، و د بیاڤێ سەربازی ژی دا چەندین هێرش کرنە سەر دەڤەرێن دەوروبەر وەك (نۆبە) و پشتی هنگێ پایتەختێ خۆ ڤەگۆهاستە باژێرێ (مەنفیس)، گرنگترین پاشمایێن سەردەمێ ناڤەراست ژی دو پەرستگەهن، یا ئێکێ ل (کەرنەك) بۆ خوداوەندێ (ئامون) هاتیە دروستکرن، یا دووێ ژی ل باژێرێ (هیلیۆپۆلیس) بۆ پەرستنا خوداوەندێ (رەع).

بەلێ دوبەرەکیا ناڤبەرا میرێن ڤێ بنەمالێ و هاتنا چەند شاهێن بێهێز و لاواز بۆ سەر کاری کو نەشیان بەرهنگارا تەخا دەسهەلاتدار و تەخا لەشکری بکەن، هەروەسا شاهێن ڤێ بنەمالێ بۆ مان و پاراستنا دەسهەلاتا خۆ پشت ب لەشکرەکێ بەردەوام دبەست بەلێ بەروڤاژی ئەڤ لەشکرە هەردەم دبوونە جهێ مەترسییێ بۆ دەسهەلاتێ ئەڤێ ژی رێ بۆ هکسۆسا خۆشکر کو ل دەوروبەرێن سالا ١٧٨٥ ب.ز هێرشێ بکەنە سەر وەلاتێ مسرێ و داگیرکەن.

## هکسۆس:

هکسۆس چەند کۆمەلێن تێکەل بوون، کو ژ گەلەك تۆخما پێکهاتبوون و ل وەلاتێ شامێ ئاکنجیبوون ژ بەر لاوازیا دەسهەلاتێ ل مسرێ و پەیدابوونا هشکەسالیێ ل دەڤەرێن شامێ لسەر دەمێ شانشینا ناڤین هێرش کرە سەر دەڤەرا (دەلتا) و داگیر کر و شیان بۆ ماوێ دووسەدەیان حوکمی تێدا بکەن و ئەڤ سەردەمە ژی ب سەر دەمێ ئاژاوا دووێ دهێتە هژمارتن کو تێدا بنەمالێن (سێزدێ هەتا هەڤدێ) حوکم دکر.

شاهێن هکسۆسا د بیاڤێ سیستەمێ حوکم کرنێدا مفا ژ سیستەمێ فیرعەونا وەرگرتبوو ژبەر هندێ لسەر شێوازێ وان حوکم کریە، ئەڤە وێ ناگەهینیت کو تنێ مسریان کاریگەری لسەر هکسۆسا هەبیت بەلکی بەرۆڤاژی هکسۆسان ژی چەند بیاڤاندا کاریگەری کریە سەر شارستانیەتا مسریان ژ وان وەك پووتە دان ب کانزا، ب تایبەتی برونز و سفر، بکارئینانا هەسپان و گرێدانا پایتونا شەری ب هەسپانڤە کو ئەڤە بۆ جارا ئێکێ بوو د مسرێدا بهێتە بکارئینان، هەروەسا بکارئینانا کەل و پەلێن شەری وەك شیرێ جەمیای و تیروکڤانێن لێکدای، ئەڤە زێدەباری پووتەدان ب بیاڤێ زانستێ و دانانا چەند لاپەرەکا دەربارەی بیروباوەرێن ئاینی ژ بلی بیروباوەرێن ئاینێن کەڤنێن مسریان و خوداوەندێن وان و هندەك بیروباوەرێن دەڤەرێن دی ژی تێکەلی بیروباوەرێن مسریان کرن.

هەروەسا هکسۆسا باژێرێ ئەڤاریس (تەنیس) دروستکر و کرە مەلبەندێ دەسهەلاتا خۆ، بۆ رزگاربوونێ ژ هکسۆسا مسری بەردەوام دگەلدا د ململانێ و هەڤرکییێدا بوون. بۆ ڤێ مەرەمێ دگەلدا کەتنە شەری کو زێدەتر ژ ماوێ نیڤ سەدەی ڤەکێشا هەتا وی دەمێ ژ ئالیێ دەسهەلاتداریا مسرا سەری کر حوکم ل باژێرێ (گیبە) دکر، شیاین لسەردەمێ شاه (ئوحموس) ل سالا ١٥٨٨ ب.ز ب تەواوی داویێ ب دەسهەلاتا وان بینن و سەردەمەکێ نوو د مێژوویا کەڤنا مسریدا دەسپێبکەت، کو ب سەردەمێ شاهنشینا نوو یان ئیمبراتۆریەت هاتیە نیاسین.

## سەردەمێ شاهنشینا نوو (سەردەمێ ئیمپراتۆریەتێ ١٥٧٣ - ١٠٨٥ ب.ز):

ئەڤ سەردەمە هەرسێ بنەمالێن هەژدێ و نوزدێ و بیستێ ب خوٚڤەدگریت، کو (ئوحموسێ ئێکێ) ب دامەزرێنەرێ ڤێ بنەمالێ دهێتە هژمارتن، ڤێ کەساتیێ دەسپێکر ب بەرهنگاریا وان بارودوخێن دژوارێن هەین و پووتە ب لەشکری دا داکو هکسوٚسا ب تەواوی ژ وەلاتێ مسرێ دەربێخیت، هەمی ئەو دەڤەرێن کو د سەردەمێ بەرێدا لبن دەسهەلاتا مسرێ بوون وەکی بەرێ زڤراندنەڤە، بڤێ چەندێ داوی ب شەڕ و ئاژاوا ناڤخوٚیا وەلاتی هات، پشتی ئوحموسێ ئێکێ زنجیرەکا شاهان هاتنە سەر تەختێ حوکمی و شیان بنەمالەکا بەرفرەهـ ل مسرێ دامەزرینن، زێدەباری مسرێ دەڤەرێن سوریا و فەلەستین و سوٚدان و لیبیا یا ئەڤرو ژی ڤەگرت.

پشتی مرنا (ئوٚتوٚمس) وەلات جارەکادی کەفتە دنێڤ ئاژاو و نەئاراميێدا و بوونە دو پشك، پشکا ئێکێ باوەری هەبوو کو (حێشپوت)ێ مافێ وەرگرتنا دەسهەلاتێ هەیە. پشکا دووێ باوەری هەبوو کو رەوشت و تیتالێن جڤاکی رێی نادەنە ژنێ دەستەلاتێ وەربگریت. لەورا (حێشپوت)ێ شوو ب (ئامونحوتبێ سیێ) کر، بەلێ دەسهەلاتا راستەقینە د دەستێ حێشپوتێ دا بوو، ئەڤەژی ب تایبەتی پشتی کو کەسانێن ئاینی سەر ب خوداوەندێ (ئامورن) ڤە چیروٚکەك بەلاڤکر کو ئەڤە کچا خوداوەندێ ئاموونە، ژبەر هندێ پێدڤیە دەسهەلاتێ وەرگریت و ل ڤێرێ حێشپوت بوو فیرعەون و چەندین ناسناڤ دانانە سەر خوٚ وەك میرێ مەزن و حوکمدارا ئەردی و کچا شاهی و مەزنا هەردو ئەردان، لسەر دەمێ ڤێ حوکمی وەلاتی تەناهی و ئاسایش بخوٚڤە دیت و دەست ب دروستکرنا پەرستگەهەکا مەزن ل دەڤەرا (دێر) ل روٚژئاڤایێ (نیل)ی ل نێزیك باژێرێ ئەقسەر کر و پەیوەندی لگەل دەڤەرێن دەورووبەر و دەرڤە بهێز کرن.

## ئامنحوتبێ سێیێ:

ژ شاهێن ناڤدارێن سەردەمێ ڤێ ئیمپراتۆریەتێ یە، ئەڤ کەسایەتیە شیا هێرشێ بکەتە سەر وەلاتێ شامێ و هکسۆسا و بتەواوی ژ ناڤ ببەت و سنوورێ دەسهەلاتا دەڤەرێن مسرێ و نۆبە هەتا رووبارێ فورات درێژ بکەت، هەروەسا گرنگی ب لەشکری دایە و پایتون و هەسپ ژی تێدا بکار ئینانە، پاشی گەلەگەشتی (اسطول) ەکێ مەزن دامەزراند و شیا دەسهەلاتا خۆ بگەهینتە دەریایا ناڤەراست و دەڤەرا گزیرتێن دەریایا ئیجە.

## ئامونحوتبێ چارێ:

ئەڤەژی ئێك ژ شاهێن دیترێن ڤی سەردەمی و پشتی مرنا بابێ وی ل سالا (**١٣٧٥** - **١٣٥٠** ب.ز) حوکم وەرگرتی، ڤێ کەسایەتیێ ژ بۆ پاراستنا وەلاتێ مسرێ هێرش کرە سەر وەلاتێ نۆبە و ناسناڤێ ئەخناتونی دانا سەر خۆ کو ب رامانا (خوشتڤیێ خوداوەندێ ئاتون) دهێت، پاشی شۆرەشەکا ئاینی کر و تێدا داکوکی لسەر وێ چەندێ کر، کو بتنێ خوداوەند ئاتون (رۆژ) ل مسرێ بهێتە پەرستن.

## هۆکارێن روودانا ڤێ شۆرەشێ:

١- بەری ئەخناتون حوکمی وەربگریت دەسهەلاتا زەلامێن ئاینێ خوداوەند ئامون ژ ئالیێ سیاسی و ئاینی ڤە یا زۆر بوو، دڤیا ب رێیا ڤێ شۆرەشێ دەسهەلاتا وان کێم بکەت.

٢- گەلەك ژ زەلامێن ئاینێ خوداوەندێن دیتر وەك (رەع) و (پتاح) ل مەنفیس پشتەڤانی لێ کر دژی زەلامێن ئاینێ باژێرێ (طيبة) هاندا.

٣- زێدەباری هندێ کو گەلەك ژ ماقیلان و وەزیران و سەرکردێن لەشکری هاندان بۆ بەلاڤکرنا ڤی ئاینی دکر.



وێنێ ژمارە ( ٢٨ )

ئامونحوتبێ چارێ (ئەخناتون) لگەل نەفەرتیتی یا هەڤژینا وی

٤- خەلكێ مسرێ هزر د هێزا وەلاتێ خۆ دا كر و لاوازیا مسریان د وی سەردەمیدا بۆ خوداوەندێن خۆ ڤەدگەڕاند ژ بەر هندێ وان وەسا هزر دكر كو وان پێویستی ب خوداوەندەكێ سەرەكی و سەرانسەری هەیە.

٥- هەروەسا د چەند تێكدانا هاتیە، كو باسێ مفایێن خوداوەندێ ئاتون دكەت، دبێژیت خوداوەندێ خێر و خۆشیێ و بەرەكەتێ بسەر ولاتیدا درێژیت.

٦- هندەكێن دیتر هۆكارێ ڤێ شۆرەشێ بۆ ئەخناتونی ڤەدگەرینن، كو دایكا وی و هەڤژینا وی (نەفەرتیتی) كارتێكرن لسەر هەبیت و ئەڤ شۆرەشا ئاینی كربیت.

پشتی هینگی ئەخناتونی دەست ب دروستكرنا پایتەختەكی كر بناڤێ (ئەخن ئاتون)، كو نهو ب (تل العمارنه) بەرنیاسە د ناڤەراستا مسرێ دایە.

## ئەو هوكارێن بووینە ئەگەرێ دروستكرنا ڤی پایتەختی:

١- بۆ هندێ كو ببیتە بنگەهێ دەسهەلاتا سیاسی و ئاینی و ژ بۆ پاراستنا دەسهەلاتا خۆ.

٢- جهەكێ بكێرهاتی و گونجای بوو ژ بەر هەبوونا رووبارێ نیل ل رۆژهەلاتی هەروەسا زنجیرا چیایەك ژی ب رەخ ڤە هەیە، بۆیە ئەگەرا هندێ كو ب ساناهی نەهێتە داگیركرن.

٣- بۆ هندێ كو باژێرەكێ گونجای و نوو بۆ خوداوەندێ ئاتون دامەزرینیت، هەر وەسا دا یێ دوور بیت ژ بەرهنگاریا زەلامێن ئاینی یێن باژێرێ (طيبة) ژی كو هەمبەریا ڤی ئاینێ نوو دكر.

پشتی کو ئەخناتونی (توت ئەنغ ئامون) دەسهەلات وەرگرتی و شیای ئارامی و ئاسایشێ د ولاتیدا بەرقەرار کەت، کەفتە ژێر فشارا زەلامێن ئاینی و نەچار کر کو دەست ژ پەرستنا ئاتونی بەردەت، و ڤەگەریتەڤە سەر پەرستنا خۆدایێ (ئامون)ی و ئەخناتونی بجە بهێلیت و بزڤریتەڤە باژێرێ (طیبة) ل وێرێ دەست ب چاککرنا پەرستگەها خوداوەند ئامون کر و گرنگی ب پێشکەفتنا شارستانیەتێ دایە...

ل دویف (توت ئەنغ ئامون)یدا چەند دەسهەلاتدرێن دی دەسهەلات وەرگرتیە و هەتا ماوەکی د بەردەوام بوون بەلێ دەرئەنجام دەسهەلاتا ئیمپراتۆریەتێ ب داوی هات ئەڤە ژی ژ بەر کو کرێگرتیێن لیبی و نۆبی بوونە ئەگەرێ لاوازیا لەشکرێ مسرێ و دەرکەفتنا حیسیان، کو بەردەوام جهێ مەترسیێ بوون لسەر مسرێ، هەروەسا دەرکەفتن و خورتبوونا دەسهەلاتا زەلامێن ئاینی وەکو تەخەك، کو زێدەتر دەسهەلاتا ئیمپراتۆریا وان لاوازکریە، هەتا کو هندەك جارا دەسهەلاتا وان هند زێدەکریە کو بوویە ئەگەرێ کۆشتنا شاهی وەك کۆشتنا رەمسیسێ سیێ.

## سەردەمێ داویێ:

ئەڤ سەردەمە ژ بنەمالا بیست و ئێکێ هەتا داویا سیستەمێ بنەمالان و هاتنا سوپایێ عەرەبێن موسلمان بۆ مسرێ ڤەدگریت.

پشتی سەردەمێ ئیمبراتۆریێ ب داوی هاتی هەڤرکی کەفتە دناڤبەرا بنەمالا دەسهەلاتدارا فیرعەونا لسەر دەسهەلاتێ و ولات تووشی ئاژاوێ بوو ب تایبەتی ژی هەڤرکیا دناڤبەرا دەسهەلاتدارێن باژێرێ تەنیس و زەلامێن ئاینێ خوداوەند ئامون، ئەڤە ژبلی هاتنا لیبیان بۆ دەڤەرێن مسرێ، ئەڤەژی بوویە ئەگەرێ لاوازیا بارێ سیاسی و

ئابووری و جڤاکی هەتا دەمێ هاتنا فارسێن ئەخمینی و پشتی وان ژی یونانی.

بەلێ د هەمان دەمیدا مەترسیا ئاشوریا بۆ سەر مسرێ زێدە بوو لسەر دەمێ (ئەسەر حەدون)دا شیان دەسەلاتا خۆ ب سەردا بگرن. پشتی هنگێ فارسێن ئەخمینی (هەخامەنشیا) لسەر دەمێ دەسهەلاتا قەمبیزی وەلاتێ مسرێ گرت. پشتی ڤێ چەندێ ژی داگیرکرنا یونانیان دەسپێکر و ئەسکەندەرێ مەکدونی مسر کرە پارچەیەك ژ ئیمپراتۆریەتا خۆ و باژێرێ ئەسکەندەریە دامەزراند. پشتی مرنا ئەسکەندەری ل سالا ٣٢٣ ب.ز ئیمپراتۆریەتا وی دناڤبەرا سەرکردێن سەربازیێن وی دا هاتە دابەشکرن، ئەو بوو مسر کەفتە بەر بەتلیمۆسی و ب ڤێ دەسەلاتا بەتالیسان ل مسرێ دەسپێکر و مسر کەتە بن کاریگەریا شارستانیەتا یونانیان و ئەڤ سەردەمە هەتا سالا ٣٠ ب.ز یێ بەردەوام بوو.

پشتی ئەڤێ ژی سەردەمەکێ دی دەسپێکر کو ئەوژی سەردەمێ رۆمانیان بوو ب هاتنا ئۆگستۆسی لسەر دەمێ شاژنا مسرێ (کلیۆباترا) دەسپێدکەت. بڤی رەنگی مسر لبن دەسهەلاتا رۆمانیا مایە هەتا موسلمان ب سەرکرداتیا (عمرو کورێ عاصی) ل سالا ٦٣٩ ز مسر گرتی.

**چالاکی:**

گرۆپەك ژ قوتابیان بەلاڤۆکەکا دیواری دەربارەی هەرەمان دروستبکەن.

## پرسیارێن بەندێ پێنجێ

پ ١/ ڤان ڤالاییێن خارێ ب پەیڤەکا گونجای پربکە:

١- مسر بوویە خالا ب ئێك گەهاندنا هەرسێ کێشوەرێن جیهانا کەڤن ------------- و ------------- و -------------.

٢- مسر ب دەرکەفتنا ------------- پێ هاڤێتیە د چەرخێن نوو دا.

٣- گرنگترین هەرەمێن مسرێ پێکهاتینە ژ ------------- و ------------- و -------------.

٤- گرنگترین شوونوارێن شاهنشینا دووێ پێکهاتبوون ژ دو پەرستگەهان ئێك ژ وان بۆ خوداوەندێ رەع ل بازێرێ ------------------------- یا دووێ ژی بۆ خوداوەندێ ئامون ل بازێرێ -------------------------.

پ٢/ ڤانا بناسینە:

١- مینا ٢- زۆسەر ٣- توت ئەنغ ئامون

پ٣/ گرنگترین هۆکارێن دروستکرنا هەرەمێن مسرێ چنە؟ بهژمێرە.

پ٤/ هکسۆسی کینە؟ باسێ دەسهەلاتا وان د وەلاتێ مسرێدا بکە.

پ٥/ لسەر شورەشا ئاینێ ئەخناتونی باخڤە.

## پشکا ئێکێ
## خێزان و ئەرکێن وێ

**خێزان:** ب وێ کومەلا مرۆڤان دهێتە گۆتن یا د مالەکێدا پێکڤە دژین و چەند پەیوەندیەکێن بهێز وان پێکڤە گرێددەن.

**دوو جۆرێن خێزانا هەنە :**

**خێزانا بچووک:** پێکهاتیە ژ ژن و مێر و کور و کچێن وان.

**خێزانا مەزن:** ژ بلی دایك و باب و زارۆکێن وان، کەس و کارێن وان ژی د گەلدا دژین وەکی باپیر و داپیر و مام و خال و مەتا زارۆکان.

### بزاڤ و چالاکی:

١- قوتابیێ خوشتڤی تو ژی وێنێ خێزانەکا بچووك ب دەفتەرا خۆ یا بزاڤ و چالاکیان ڤەنە.

٢- وێنێ خێزانەکا مەزن بگرە و ب دەفتەرا خۆ یا بزاڤ و چالاکیان ڤەنە.

د خێزانێدا مەزن چاڤدێریا بچووکی دکەت و بچووك رێزێ ل مەزنی دگریت و گیانێ ڤیان و هاریکاری و دلسوزی و هۆگریێ دناڤدا پەیدادبیت و د خۆشی و نەخوشیاندا پشکدارن.

بۆ نموونە ئەگەر ئێك ژ ئەندامێن خێزانێ نەخۆش بوو دێ کار کەتە سەر هەمی خێزانێ دلتەنگ کەت و گەرەکە چەند کەسەك ژی کاروبارێن خۆ بجه بهێلن و ب رەخڤە روونن و خزمەتا وی بکەن.

هەژی گوتنێ یە خێزان چەندا بچووك ژی بیت، ئەندامەکە ژ خێزانەکا مەزن کو هەمی هەڤنیشتیمانیێن لسەر ئاخا کوردستانێ ڤەدگریت کو مالا مە هەمیانە، ئانکو ب هەڤرا دبنە خێزانەکا زۆر مەزن،

ژ کۆمەکا پەیوەندیێن بهێز ئەندامێن وێ خێزانا مەزن ئانکو (کورد) پێکڤە گرێددەت.

| ئەو پەیوەندیێن کو مللەتێ کورد پێکڤە گرێددەت | | | |
|---|---|---|---|
| هەڤسوویی | هەڤنیشتیمانی | نەتەوەیی | مرۆڤاینی |

**قوتابیێ خۆشتڤی ژ بلی نەتەوێ کورد ناڤێ چەند نەتەوێن دیتر بنڤیسە :**




## ئەرکێن خێزانێ بەرامبەر زارۆکی :

خێزان رۆلەکێ سەرەکی و گرنگ د پەروەردەکرن و خودانکرن و ئاراستەکرنا زارۆکان دا بینیت، ئەم دشێین ڤی رۆلێ کاریگەرێ خێزانێ د ڤان خالێن خارێدا دیار کەین:

١- زارۆك ژ خێزانێ فێری رەوشتێن جوان و پەرستنا خودێ و رێنمایێن جڤاکی دبیت، و د ناڤ خێزانێ دا فێری زمانێ ئاخفتنێ دبیت.

٢- داینگەه و پەروەردەکرنا زارۆکی ب تایبەتی د سالێن دەسپێکا ژیانێدا هەتا دەمێ دشێت خۆ خودانکەت، زارۆك چەندین سالا لبن چاڤدێری و سەرپەرشتی و پاراستنا خێزانێدا دژیت، خێزان جل و بەرگ و پێدڤیێن وی یێن خوارنێ و ساخلەمیێ بۆ پێشکێشدکەت.

٣- زاروك ژ خێزانێ فێری گەلەك کارێن جوان دبیت وەك پاقژیا لەشی و جل و بەرگان و رێزگرتنا خەلکی و چاوانیا ئاخفتنێ دگەلدا و چاندنا تۆڤێ ڤیانێ و هاریکاریکرنا خەلکی و دەستدرێژی نەکرنا

سەر سەر و سامانێن وان و راستیبێژی و لێبۆرین و رێزگرتنا هزر و بیرێن کەسێن دیتر و پاراستنا ژینگەهێ و هەمی ئەو کەل و پەلێن کو ملکێ گشتی نە.

٤- خێزان پشتراستیێ و ژیانەکا تەنا بۆ زارۆکی دابین دکەت و رۆلەکێ گرنگ هەیە د ئاڤاکرنا کەساتیا زارۆکیدا.

٥- زارۆك د خێزانێ دا فێری دەسپێکێن ژیانا جڤاکیا رێك و پێك دبیت.

## بزاڤ و چالاکی:

١- قوتابیێ خوشتڤی هندەك رەوشتێن جوان کو د پەرتووکا تەدا نەهاتبنە نڤیسین بنڤیسە کو زارۆك ژ خێزانێ فێردبیتێ.




٢- هندەك پێدڤیێن ژیانا زارۆکی بنڤێسە کو خێزانا وی بۆ دابین دکەت ب مەرجەکی ئەو پێدڤیە د پەرتووکا تەدا نەهاتبنە نڤیسین:



٣- ژ ڤان پيتێن خارێ (دو) پەیڤا دروست بکە کو دو دیاردێن خرابن پێدڤیە ئەم هەمی خۆ ژێ دوور بێخین:

| د | د | ی |
|---|---|---|
| ر | ۆ | ز |

٤-

مامۆستایێ رێزدار داخازێ ژ قوتابیێن خۆ بکە چەند رێزەکا دەربارەی رێزگرتنا مەزنا ژ لایێ بچووکا ڤە بنڤیسن.

٥-

قوتابیێ هێژا وێنێ زارۆکەکی کو دەستێ باپیرێ خۆ گرتیە و ژ جاددێ دەربازدکەت بێخە دناڤ دەفتەرا خۆ یا بزاڤ و چالاکیاندا.

## پرسیار

١- ڤان ڤالاهیێن خارێ ب پەیڤەکا گونجای پربکە:

أ- هندەك خێزان د بچووکن و پێکهاتینە ژ -----------، -----------، -----------، -----------.

ب- مەزن -----------بچووکی دکەت و بچووك ژی ----------- ل مەزنی دگریت.

ج- زارۆك د ناڤ خێزانێدا فێری زمانێ ----------- دبیت.

د- زارۆك رەوشتێن جوان ژ خێزانێ وەردگریت وەك -----------، -----------، -----------.

٢- راست و شاشیێن ئەڤێن خارێ دیار بکە:

أ- زارۆك هەر ل دەسپێکا ژیانا خۆ دشێت پشت ب خۆ ببەستیت.

ب- خێزان هەر چەندا بچووك ژی بیت ئەندامەکە ژ خێزانەکا مەزن.

ج- خێزان پشتراستییێ و ژیانەکا تەنا بۆ زارۆکی دابین دکەت.

٣- ب کورتی و لپەی بۆچوونا خۆ ئەڤێن خارێ پێناسە بکە:

(خێزان - راستیبێژی - کوردستان - کورد)

| --------------- <br> ---------- <br> ----- | فێرخاز |
|---|---|

## قوتابی کیه؟

قوتابی ئەو مرۆڤە یێ خواندنێ دکەتە پیشە دا کو فێری زانستێ ببیت و د پاشەرۆژێدا بۆ خێزان و جڤاکێ خۆ کەسەکێ مفاداربیت.

## ئەرکێن قوتابی بەرامبەر قوتابخانا وی

ژ بەر وێ چەندێ کو قوتابی ئەندامەکە د ناڤ خێزانا خواندنگەهێدا و قوتابیێن خواندنگەهەکێ دێ دگەل ئێك بنە دوست، پێدڤییە ناڤبەرا وان خۆش بیت و تەبایی هەبیت و بەرژەوەندیا هەڤدو بڤێت و هاریکاریا هەڤدو بکەن و هەڤپشکیێ د کاروبارادا بکەن و رێزێ ل هەڤدو بگرن و رێزێ ل رێڤەبەر و مامۆستا و کارمەندێن خواندنگەهێ ژی بگرن و کەل و پەلێن خواندنگەها خۆ ژی بپارێزن. قوتابی د خواندنگەهێدا چەند ئەرکەك دکەڤنە سەر ملێن وی پێویستە لسەر وی بجە بینیت، ئەو ئەرك ژی پێکهاتینە ژ:

١- پەیرەوکرنا یاسا و سیستەمێ خواندنگەهێ، ئەو سیستەمێ کو وەزارەتا پەروەردا هەرێما کوردستانێ دانای بۆ هەمی قوتابیان داکو تێکدان و ئاژاوە روو نەدەن و کەس ب ئارەزوویا خۆ دناڤ خواندنگەهێدا رەفتارێ نەکەت. گەرەکە قوتابی پێگیرێن یاسایا خواندنگەهێ بن و ژ چارچووڤێ سیستەمی وێ دەرنەکەڤن، چونکە ئەڤ سیستەمە ژ بۆ بەرژەوەندیێن وان و پاراستنا مافێن وان و رێکخستنا کاروبارێن وان هاتیە دانان.

٢- گوهداریا شیرەتێن رێڤەبەر و هاریکار و مامۆستا و فەرمانبەرێن خواندنگەها خۆ بکەن و دڤێت قوتابی چ ب باش بزانیت ژ بۆ بەرژەوەندی

و سەربلندیا خواندنگەها خۆ بجھ بینیت و هەرگاڤ هاریکاریێ کارمەندێن خواندنگەها خۆ بیت.

٣- بجهئینانا ئەرکێن خواندنگەهێ بۆ نموونە:

أ بەرهەڤکرنا وانان

ب بەرهەڤکرنا ئەرکێ مالی

ج حازر بون ل دەمێ دەوامێدا

د ج جار غائیب نەبیت ژ قوتابخانێ بێ چ ئەگەر

ئەگەر قوتابی ئەڤ کارێن سەری بجھ نەئینیت ئەو مانديبوون و زەحمەتا ژ لایێ خێزانێ و دەولەتێ و خواندنگەهێ ڤە پێڤە هاتیە برن دێ بھەروە چیت.

٤- پێدڤییە قوتابی خواندنگەها خۆ ب مالا خۆ بزانیت و بپارێزیت و پاقژ راگریت و هەرگاڤ پشکداریێ د وان بزاڤ و چالاکیاندا بکەت یێن دهێنە کرن بۆ چاککرن و سەراستکرنا کێم و کاسیێن خواندنگەها وی چونکە خواندنگەھ مولکێ هەمیانە.

ئەگەر قوتابی هەر رۆژەکێ ژ ڤان رووژێن خارێ یێن خواندنگەها خۆ ل:

| ڕێز | تاقیگەهـ | پەرتووکخانە | ژۆرا هونەری | ژۆرا وەرزشێ | ژوورا کۆمپیوتەری |
|---|---|---|---|---|---|

بیت دڤێت ئاگەهدارێ کەل و پەل و کەرستا بیت وەسا هەست بکەت کو هەر تشتەکێ د ناڤ خواندنگەهێدایە مولکێ هەمیانە و بۆ وان قوتابیانە ژی یێن پشتی ڤان دبنە قوتابیێن ڤێ خواندنگەهێ، ژبەر هندێ نابیت دەسکاریا وان کەل و پەلا بکەت و تێکدەت و بشکێنیت.

٥- پاراستنا وان پەیوەندیان یێن قوتابیێن خواندنگەهەکێ پێکڤە گرێددەت وەك گیانێ تەبایی و ڤیان و هاریکاری و باوەری پێکرن و رەفتارێن جوان و هەڤالینیێ:

## بزاڤ و چالاکی:

١- مامۆستایێ رێزدار هاریکاریا قوتابیێن خۆ بکە هەتا چەند ئەرکێن دیتریێن قوتابی بەرامبەر خواندنگەها وان بهژمێرن.

٢- قوتابیێ خوشتڤی بزاڤێ بکە چەند مفایێن پەیرەوکرنا یاسا و سیستەمێ خواندنگەها خۆ بهژمێرە.

٣- قوتابیێ خوشتڤی رێڤەبەر و هاریکار و مامۆستایێن تە هەردەم شیرەتان ل هەوە دکەن بۆ کارێ جوان و مفادار ژ وان شیرەتان، وەك:



٤- قوتابی دشێت پشکداریێ د چاککرن و سەرڕاستکرنا کێم و کاسیێن خواندنگەهێدا بکەت وەك:

أ

چاککرنا کورسیکێن شکەستی

ب

ج

## پرسیار:

١- راست و شاشێن ئەڤێن خارێ دیاربکە:

أ- ئەگەر قوتابیەکی پلا ئێکێ بدەستڤەئینا د هەر هەڤرکیەکا دناڤبەرا خوێندنگەهاندا ئەو سەربلندی بۆ وی بتنێ یە.

ب- وەزارەتا پەروەردا هەرێما کوردستانێ سەرپەرشتییا کاروبارێن پەروەردە و فێرکرنا قوتابیێن کوردستانێ دکەت.

ج- ئەگەر خواندنگەهەکێ دو رێڤەبەر هەبن کار دێ ب رێك و پێکی برێڤە چیت.

د- نابیت قوتابی ئەرکێ ئەڤرۆ بۆ سوبەهی پاشبێخیت.

٢- بکورتی مفایێن ئەڤێن خارێ بنڤیسە:

أ- تاقیگەهـ.

ب- پەرتووکخانە.

ج- بابەتێ هونەری.

٣- ڤان ڤالاهيێن خارێ ب پەيڤەكا گونجاى پڕبكە:

أ- قوتابى ئەو مرۆڤە يێ ------------ دكەتە پيشە.

ب- قوتابيێن خواندنگەهێ دناڤبەرا خۆ دا دبنە دوست پێدڤييە ناڤبەرا وان يا خۆش بيت و ------------ ، ------------.

ج- ئەگەر قوتابى ئەركێن ناڤ خواندنگەهێدا بجه نەئينيت ئەو مانديبوون و زەحمەتا ژ لايێ ------------ و ------------ و ------------

ڤە پێڤە هاتيە برن دێ ب هەرەوە چيت.

٤- ب كورتى و لپەى بۆچوونا خۆ ئەڤێن خارێ پێناسەبكە:

(هاريكار - ئەركێ ماڵ - كۆمپيوتەر)

# قوتابی د خێزانێدا

خێزان ب ژینگەها ئێکێ یا جڤاکی دهێتە هژمارتن و قوتابی ژی ئەندامەکێ وێ خێزانێ یە، ئەرکێ هەرەگرنگێ خێزان دژیانێدا ئەوە کو زارۆك هەبن و باش پەروەردەبکەن.
قۆناغا فێربوونا ئێکێ یا زارۆکی دناڤ خێزانێدایە هەر خێزانەك ژی جل و بەرگان و یاریان و پێدڤیێن ژیانێ بۆ دابین دکەت.

## بزاڤ و چالاکی:

| قوتابیێ خۆشتڤی تو ژی (٥) ژ وان پێدڤیێن کو خێزان بۆ قوتابیان دابین دکەت د دەفتەرا خۆ یا بزاڤ و چالاکیان دا بنڤیسە. |
|---|

زارۆك د ناڤ خێزانا خۆ دا فێری گەلەك تشتا دبیت و چاڤ ل وان دکەت، هەر ژ ئەندامێن دیترێن ژ خۆ مەزنتر یێن خێزانا خۆ فێری هاریکاری و رێزگرتن و گوهداریێ دبیت.
زارۆك بەرهەمێ خێزانێ یە و مال ب وان یا جوان و ئاڤدانە و جهێ دلخۆشیا دایك و بابانە، دڤێت گەلەك لێ د هشیاربن.
پێدڤیە لسەر دایك و بابان بەرێ زارۆکان بدەنە خواندنێ و هەمی پێدڤیێن بەردەوامبوونێ لسەر خواندنێ بۆ ئامادەبکەن و ب بەردەوامی چاڤدێریا ئەرکێن وان یێن خواندنگەهێ بکەن و لپەی گازیا خواندنگەها زارۆکێن خۆ بچن، دا پشت راست بن ژ ئاستێ خواندنا زارۆکێن خۆ جارجارا سەرەدانا خواندنگەهێ بکەن، د کۆمبوونێن جڤاتا دایك

و بابان و مامۆستایاندا ئامادەبن، زارۆكێن خۆ ژ كارێن شاش و خراب بپارێزن و چاڤدێریا وان بكەن هەتا ب تەواوی مەزن دبن.

<table>
<tr><td colspan="2">وەك وەفاداریەك بۆ ئەرك و ماندیبوونا دایك و بابان دڤێت قوتابی چاكیا وان بدەتێ ڤە ئەوژی ب ئەنجامدانا كۆمەكا كارێن چاك وەك ئەڤێن خارێ:</td></tr>
<tr><td>بزاڤكرن بۆ بەختەوەریا خێزانا خۆ</td><td>پاراستنا سیستەمێ خێزانا خۆ</td></tr>
<tr><td>دەرچوون ب پلێن بلند ل خواندنگەهێ</td><td>دەست نەبەردان ژ رەوشتێن جوان</td></tr>
<tr><td>دوور كەفتن ژ زارۆكێن خراب</td><td>رێزگرتنا دایك و بابان</td></tr>
<tr><td>گوهداریا شیرەتێن دایك و بابان</td><td>هاریكاریا دایك و بابان</td></tr>
</table>

## بزاڤ و چالاكی:

بزاڤ و چالاكی:

١- قوتابیێ خوشتڤی ئەگەر كچ بی یان كور د دەفتەرا بزاڤ و چالاكیێن خۆ دا (٥) ژ وان كارێن جوان بنڤیسە یێن تو ژ دایك و بابێن خۆ فێربووی و تە چاڤ ل وان كری.

٢- مامۆستایێ رێزدار هندەك روونكرنا بۆ قوتابیێن خۆ بێژە سەبارەت چاوانیا دەسپێكێن دامەزراندنا خێزانێ.

## پرسیار:

١- ڤان ڤالاهیێن خارێ ب پەیڤا گونجای پربکە:

أ- ژ وان پێدڤیێن خواندنێ کو خێزان بۆ قوتابی دابین دکەت وەك ------------ و ------------ و ------------.

ب- خێزان ب ژینگەها ئێکێ یا ------------ دهێتە هژمارتن و ------------ ژی ئەندامەکێ وێ خێزانێ یە.

ج- ژ نموونێن کارێ شاش و خراب کو پێدڤیە قوتابی ژێ دووربکەڤیت وەك ------------ و ------------ و ------------.

د- دایك و بابێن قوتابی گەلەك شیرەتان ل زارۆکێن خۆ دکەن ژ وان شیرەتێن چاك وەك ------------ و ------------ و ------------.

## پشکا دووێ
## قوتابی د خواندنگەهێدا

### خواندنگەه:

دەزگەهەکێ زانستی گشتی و جڤاکیە قوتابی تێدا فێری پەروەردە و زانستێن جودا جودا دبیت.

بەرێ خواندنگەهێ بڤی شێوازێ پێشکەفتیێ نهۆ نەبوو، ل دەسپێکێ ژیانا مرۆڤان گەلەك یا سادە و ساناهی بوو بەلێ هێدی هێدی لپەی پێدڤیێن ژیانێ گەریان ئێدی پێدڤیا خواندن و فێربوونێ ژی پەیدابوو هەتا کو وەلێهاتی کو جڤاك هزرێ د دانانا دەزگەهەکێدا بکەت بۆ فێرکرن و پەروەردەکرنا کورێن گەلێ خۆ دا بشێن ب سەر ئاستەنگێن ژیانێ دا سەرکەڤن، ئێدی خواندنگەهـ وەك پێدڤیەك هاتە گور د دەسپێکێدا ب سادەیی د خانیەکیدا بوو ژ بۆ زاروکێن شاهان و تەخا دەسهەلاتدار و پاشی بۆ کورێن تەخێن دیترێن جڤاکی.

ژ وان کەساتیێن کوردێن ناڤدار کو رۆلەکێ کاریگەر هەبوویە د ڤەکرنا خواندنگەهاندا و هاندانا کورێن گەلێ کورد بۆ فێربوون و خواندنێ وەك:




## بزاڤ و چالاکی:

١- قوتابییێ خۆشتڤی وێنێ خواندنگەهەکێ ب دەفتەرا خۆ یا بزاڤ و چالاکیا ڤەنە.

٢- ئەگەر وێنێن هندەك ژ وان کەساتییێن لسەری دیار دەست تە کەفتن بێخە د ناڤ دەفتەرا چالاکییێن خۆ دا.

نهو د هەرێما کوردستانێدا د هەمی گوند و باژێر و باژێرکان دا هژمارەکا زۆرا خواندنگەهێن سەرەتایی و ناڤنجی و ئامادەیی هاتینە ڤەکرن، کورێن تەڤ تەخ و چینێن جڤاکی کوردەوارییێ تێدا دخوینن و مامۆستایێن خودان شیان و ژێهاتی بۆ هاتینە دابین کرن و پێدڤیێن سەرەکییێن خواندنێ ژی بۆ وان خواندنگەهان هاتیە بەرهەڤکرن وەك:

| رێزا خواندنێ | تەختە رەش | تەباشیر | پەرتووك |
| --- | --- | --- | --- |

## بزاڤ و چالاكى:

قوتابییێ خوشتڤی تو ژی ناڤێ هندەك ژ پێدڤیێن دیترین خواندنێ د دەفتەرا چالاكیێن خودا بنڤیسە قوتابی ئەندامەكێ خێزانا خواندنگەهێ یە و پێدڤیە هەردەم وەسا هزر بكەت كو خواندنگەهـ مالا وی یا دوویێ یە.

خێزانا خواندنگەهێ پێكهاتیە ژ:




مامۆستا ل جهێ دایك و بابانە و گەلەك دلسوزێن قوتابیانە، وەك كورێن خۆ لێ دنێرن و سەرەدەری و رەفتارەكا مفادار دگەلدا دكەن، هەمی شیانێن خۆ د مەزێخن هەتا ب جوانترین شێوە پەروەردە بكەن و ب نووترین رێ وان فێری زانستی بكەن، هەر دەمێ مامۆستا ببینیت قوتابیێن د وانێن خۆدا سەركەفتینە ئەو دێ هەمی ئەرك و وەستیانا خۆ ژبیر كەت.

## ئەو قوتابیێن کو مامۆستاییێن وان گەلەك دڤێن

| | |
|---|---|
| .١ | قوتابییێ سەرکەفتی د وانە و هەمی بزاڤ و چالاکی و بیرەوەرییێن خاندنگەهێدا کو سەرێ مامۆستا و خێزان و هەڤالێن خۆ بلند دکەت. |
| .٢ | ئەو قوتابییێ کو هەمی ئەرکێن سەر ملێن خۆ بێ کێم و کاسی بجه بینیت و ئەرکێ ئەڤرۆ ناهێلیت بۆ سوبەهی. |
| .٣ | ئەو قوتابییێ پێگیرییێ ب رێنما و یاساییێن خاندنگێ دکەت و چ سەرپێچیا نەکەت. |
| .٤ | ئەو قوتابییێ کەل و پەلێن خواندنگەهێ دپارێزیت و گەلەك ب هشیاری سەرەدەرییێ دگەلدا دکەت. |
| .٥ | ئەوێن پاقژیا خۆ و پاقژیا پۆل و گورەپان و هەمی جهێن خواندنگەهێ دپارێزن. |
| .٦ | ئەوێن کو خودان رێزن و رێزێ ل هەمی ئەندامێن خێزانا خواندنگەهێ دگرن. |
| .٧ | قوتابییێ راستی بێژ، دەست پاقژ، دلسۆز و خودان رەوشتێ جوان. |
| .٨ | ئەو قوتابییێن کو هەردەم بێ ئەگەر ژ خواندنگەهێ دوور ناکەڤن و ژێ نارەڤن و شەرا دگەل هەڤالێن خۆ ناکەن و تشتێن تایبەتێن هەڤالێن خۆ ژێ ناستینن. |

## بزاڤ و چالاكى:

١- مامۆستایێ رێزدار هیڤیه هندەك ژ زیانێن گیرۆبوون رەڤینا قوتابى ژ خواندنگەهان بۆ قوتابیێن خۆ باس بكه.

٢- قوتابیێ خۆشتڤى راپۆرتەكێ بۆ مامۆستایێ خۆ بنڤیسه دەربارەى راگرتنا پاقژیا خواندنگەهێ.

٣- قوتابیێ خۆشتڤى تو ژى هندەك ساخلەتێن باش یێن وان قوتابیێن كو مامۆستاى گەلەك دڤێن د دەفتەرا بزاڤ و چالاكیێن خۆ دا بنڤیسه.

## پەیوەندى دناڤبەرا قوتابیا:

خواندنگەه كۆمەلگەهەكا بچووكه و قوتابى پرانیا دەمێ خۆ تێدا دبۆرینن، ژ بۆ هندێ كو ئەڤ كۆمەلگەها بچووك هیڤى و ئارمانجێن وى بجهبینن دڤێت گیانێ تەبایێ و هاریكارى و حەژێكرن و ئاخفتنا جوان و باوەرى ب پێكهەبوونا دناڤبەرا واندا هەبیت، ڤى رەنگێ ژیانێ ژى هندەك هۆكار هەنە دبنە ئەگەرێ ب ئەنجام گەهاندنێ د رێكا پەیوەندیێن دناڤبەرا قوتابیاندا:

| گرنگترین پەیوەندیێن دناڤبەرا قوتابیێن خواندنگەهەكێدا |
| --- |

| پەیوەندیا رەوشەنبیرى | پەیوەندیا هەڤالینیێ | پەیوەندیا هەڤنیشتیمانیێ |
| --- | --- | --- |

ئەڤێ ل خارێ دێ باسێ هەر ئێك ژ وان پەیوەندیان كەین:

## ١- پەیوەندیا رەوشەنبیری:

قوتابیێن خواندنگەهێ ب تایبەتی قوتابیێن پۆلەکێ ئاستێ رەوشەنبیر یا وان نێزیکی هەڤە:

**هۆ:** بوچی قوتابیێن پۆلەکێ ئاستێ رەوشەنبیریا وان نێزیکی هەڤە؟

**بەرسڤ:** چونکە:

| | |
|---|---|
| أ | ژ ئێك ژێدەر رەوشەنبیریێ وەردگرن |
| ب | ئێك جورێ وانا دخوونن |
| ج | ئێك ئارمانج وان پالددەت ئەوژی فێربوون و زانینە |

گەنگەشا دناڤبەرا قوتابیێن ئێك پۆلدا دەربارەی زانین و فێربوونێ قوتابیان بەرەف پێشکەفتن و گەشەکرن و سەرکەفتنێ دبەت و ئەو گەنگەشە و بەرسڤدانا پرسیاران تەبایێ و ڤیانێ و رێزگرتنێ دناڤبەرا قوتابیاندا زێدەدکەت، هەر قوتابیەك شیانێن بەهرەمەندی و رادێ ژێهاتنێ و ئارەزوویێن دیتر دزانیت.

بڤی رەنگی پەیوەندیەکا موکم دناڤبەرا قوتابیادا دروست دبیت، ئەڤ پەیوەندیە پشتی دەرچوونا قوتابیان ژ خواندنگەهێ ژی هەر یا بەردەوام بیت و ببیتە جوانترین بیرهاتنا ژیانێ.

هندەك جارا قوتابیەك دناڤ هەڤالێن خۆ دا دبیتە نموونا رەوشت و کریارێن جوان و گوهداریا ماموستایێن خۆ دکەت و رێزێ لێ دگریت و د وانێن خۆدا پلێن بلند بدەستڤە دئینیت، قوتابیێن دی چاڤ لێ دکەن، ئەڤجا هەر قوتابیەکێ بڤێت وەکی ڤی لێ بهێت دێ بزاڤێ کەت خۆ نێزیکی وی بکەت و وەکی وی رەفتارێ بکەت.

## ٢- پەیوەندیا هەڤالینیێ:

قوتابی برایێن ئێکن، هەمی ب هەڤرا خەباتێ دکەن دژی دوژمنێ هەمیان کو ئەوژی نەزانینە، ب شێوێ گرۆپێ بچووك بچووك پێکڤە دخوونن و ئەرکێن مالێ بجە دئێن و پێخەمەت بدەستڤەئینانا زانین و زانستێ هاریکاریا هەڤدو دکەن و هاریکاریا هەڤدو، دا کو ئەو هاریکاری پەیدابییت دڤێت پەیوەندی دناڤبەرا قوتابیاندا لسەر بناغێ ڤیان و تەبایێ هاتبیتە ئاڤاکرن.

قوتابی گەلەك پێ خۆشە بیروبۆچوون و کریار و رەفتارێن وی ژ لایێ هەڤالێن وی ڤە دپەسند بن، بەلێ بەرۆڤاژی دێ پێ نەخوش و دلگران بیت ئەگەر پووتە پێ نەکر و ترانێن خۆ پێ کرن.

**بۆ وێ چەندێ کو هەڤالینی دناڤبەرا قوتابیاندا یا بەردەوام و بهێز بیت پێدڤیە ڤان خالێن خارێ لبەر چاڤ بگرین.**

١- چاڤنقاندن ل شاشیێن سادەیێن هەڤدو.
٢- رێزێ ل بیرو بۆچوونێن هەڤدو بگرین.
٣- گیانێ لێبۆرینێ لدەف هەبیت.
٤- ب خوشیێن هەڤدو د شادبن و هەڤپشکێن نەخوشیێن هەڤدو بن.
٥- بەلاڤ نەکرنا دەنگ و باسێن درەو و پرۆپاگەندان دژی هەڤدو.
٦- ناڤ و ناسناڤێن کرێت و نەجوان نەدانانە سەر هەڤدو و سڤکاتیێ ب هەڤدو نەکەن.
٧- دڤێت جهێ باوەریا هەڤدو بن و باوەری ب هەڤ هەبیت و بۆ قازانجێ هەمیا رەفتارێ بکەن.
٨- دڤێت قوتابی ب وەکهەڤی و ب ئێك پیڤەر و سەرەدەریێ دگەل برادەرێن خۆ بکەن و راستیێ لبەرچاڤ بێژیت و د پشترا باسێ هەڤالێن خۆ نەکەن.
٩- ل بەر سینگێ هەڤدو رانەوەستن و ژ ئێك تورە نەبن و ب خرابی باسێ هەڤدو نەکەن.
١٠- رەخنا شکاندنێ ل هەڤدو نەگرن، گەلەك ب تەناهی خرابی و کێم و کاسیێن هەڤدو بێخنە بەرچاڤ و چارەسەریا گونجای بۆ ببینن.

## بزاڤ و چالاكی:

١- مامۆستایێ رێزدار قوتابیێن پۆلێ دابەشی (٦) گرۆپا یان كێمتر بكە، پرسیارەكێ ئاراستەی وان بكە كا هەتا چ رادە ئەو چاڤ ل قوتابیێ زیرەك و خودان رەوشتێ جوان دكەن، پشتی هنگێ بزاڤێ بكە بەرسڤێن هەر (٦) گرۆپان هەلسەنگینە.

٢- قوتابیێ خۆشتڤی ل دەفتەرا چالاكیێن خۆدا چەند رێزەكا دەربارەی پەیوەندیا بهێزا دناڤبەرا تە و هەڤالێن تە دا بنڤیسە.

٣- قوتابیێ خۆشتڤی سێ خالان دەربارەی كاركرنا قوتابیان بۆ بەرژەوەندیا گشتی بنڤیسە:

أ- ---------------------------

ب- ----------------------------

ج- ---------------------------

٤- ئەگەر قوتابیەكێ هەڤالێ تە شاشیەك كر ب چ شێوە ژ ڤان شێوێن خارێ دێ تێگەهینی كو یێ شاشە، نیشانا ( ✓ ) د ناڤ چارگۆشا راستدا دانە:

أ- دێ لێ تورە بم.[ ]

ب- دێ ب دژواری رەخنێ لێ گرم.[ ]

ج- ب تەناهی تێگەهینم كو یێ شاشە.[ ]

## ٣- پەیوەندیا هەڤنیشتیمانیێ:

نیشتیمان ئەو پارچا ئەردی یا سنۆرداره کو کۆمەکا خەلکی لسەر دژین و چەند پەیوەندیەك وان پێکڤە گرێددەن.

ئەو هەمی کورێن مللەتێ مە لسەر ئاخا ڤی وەلاتێ مە یێ خۆشتڤی کو کوردستانە دژین، ئەو وەلاتێ مە ب خوها ئەنیا خۆ ب خوونا خۆ یا گەش ئاڤدای و ب گیانێ خۆ بەرەڤانی ژێ کری.

ئەڤ ئاخە و تەڤ تشتێن تێدا ژ:




مالا هەمی هەڤنیشتیمانیانە و هەمی پێکڤە ل خوشی و نەخوشیاندا هەڤپشکن و شانازیێ ب وان دەسکەفتا دکەن یێن باب و باپیرێن مە پێشکێشی مە کرین.

قوتابیێن کورد ب گشتی کورێن ولاتەکی نە و پێخەمەت پاراستن و بلندکرنا سەرفەرازیا نەتەوەیێ خۆ خەباتێ دکەن و چالاکیێن خۆ نیشاددەن، ئانکو هەستەك هەیە قوتابیێن نەتەوەیەکی بهەڤرا گرێددەت ئەو ژی هەستێ نەتەوایەتی و هەڤنیشتیمانیە.

## پرسیار:

١- ب كورتی و لپەی بۆچوونا خۆ ئەڤێن خارێ پێناسە بكە:-

(نیشتیمان - فێرخواز - حەبسەخانا نەقیب - لێبورین)

٢- بەرسڤا راست دناڤ كڤانادا هەلبژێرە:

قۆناغا خواندنا ناڤنجی (٢ ، ٣ ، ٤ ) سالە

٣- دڤی خشتێ خارێ دا ناڤێ دو كەساتیێن كورد بینە كو رۆلێ خۆ هەبوویە د بەرەف پێشبرنا خواندنێدا ل كوردستانێ:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ه | م | م | ر | خ | ا |
| م | ق | ر | ێ | ع | ە |
| ف | ر | ن | ی | د | س |
| ن | ی | ۆ | ا | س | ش |

٤- ڤان ڤالاهیێن خارێ ب پەیڤەكا گونجای پربكە:

أ- ژ وان كانزاییێن لژێر ئاخا كوردستانێ هەین ------------- و -------------.

ب- ژ دەشتێن بژاخێن كوردستانێ -------------.

ج- د دەسپێكێدا خواندنگەه ب سادەیی د ------------- دا بوو.

د- مالا ئێكێ یا قوتابی ------------- ە بەلێ مالا وی یادوویێ -------------.

ه- ژ ئەندامێن خێزانا خواندنگەهێ ------------- و ------------- و -------------.

و- قوتابی دشێت پشکداری د راگرتنا پاقژیا خوێندنگەهێدا بکەت ب رێیا ------------ و ------------.

ز- ئەرکێ ئەڤرۆ نەهێلە بۆ ------------.

ح- خواندنگەهـ کۆمەلگەهەکا پچووکە و قوتابی پرانیا ------------ خۆ تێدا دبۆرینن.

ط- گەنگەشە دناڤبەرا قوتابیێن ئێك پولدا دەربارەی زانین و فێربوونێ وان بەرەف ------------ و ------------ و ------------ ێ دبەت.

ی- قوتابی نەخۆش و دلتەنگ دبیت ئەگەر هەڤالێن وی پووتە پێ نەکر و ------------ پێ نەکر.

# فێرخواز و جڤاك

**جڤاك:** پێکهاتیە ژ کۆمەکا مرۆڤان کو لسەر پارچە ئەردەکێ دیارکری ئاکنجیبووینە و چەند پەیوەندیەك وان پێکڤە گرێددەت.

خێزان ب ژینگەها ئێکێ یا جڤاکی دهێتە هژمارتن، هەر جڤاکەك ژ چەند ئێل و هۆزان پێکهاتیە، ئەوژی ژ چەند خێزانا پێکهاتینە. چەند بنەمایەك هەنە کو هەر جڤاکەکی ژ جڤاکێن دیتر جودا دکەت و هندەك لێکچوون ژی دناڤبەرا ڤان جڤاکێن جودا جودا دا هەنە. ئەڤ جڤاکێن نهۆ دجیهانێدا هەین (ب جڤاکێ کوردەواری ژی ڤە) ب چەند قۆناغێن ئێك ل دویف ئێکدا دەربازبووینە هەتا گەهشتینە ڤێ قۆناغا نهۆ ئەم تێدا دژین.

ژ بەر کو قوتابی ئەندامێ خێزانەکێ یە و ئەو و خێزانا وی ژی سەر ب جڤاکەکی ڤەنە کوتێدا ژدایکبووینە و ژیباینە و خێروخۆشی و بەرێ وی خاریە و د نەخوشیان ژی دا هەڤپشکێ وی جڤاکی بوون، ژبەر هندێ لگەل ئەندامێن جڤاکی چەند پەیوەندیەك ئەندامێن جڤاکی بهەڤرا گرێددەت.

قوتابی وەك ئەندامەکێ جڤاکی چەند ئەرکەك دکەڤنە سەر ملێن وی بەرامبەر جڤاکێ وی پێدڤییە بجهبینیت، ئەو ئەرك ژی پێکهاتینە ژ:

١- بزاڤکرن ژ بۆ بلندکرنا ئاستێ زانینێ و دەرچوون ب پلەکا بلند چونکە قوتابی د پاشەرۆژێدا برەنگەکێ بەرفرەهـ دێ پشکداریێ د ئاڤاکرنا ژیانا جڤاکیدا دکەتن کو ئاستێ زانینێ مەرجەکێ گرنگە بۆ وێ پشکداریکرنێ.

٢- ڤیانا نیشتیمان و گەل و وەلاتی، چونکی سەروەریا نیشتیمانی نەتەوەی سەروەریا قوتابیە ژی، گەرەکە ددەمێ پێدڤیدا قوتابی پشکداریێ د تیمێن تەنگاڤیا و تیمارکرنێ... هتد دا بکەت.

٣- هاریکاریا دەزگەهێن حکومەتا هەرێما کوردستانێ بکەت هەر ژ بۆ نەهێلانا دیاردێن نە شارستانی و دزیێ و هەمی جۆرێن دیترێن تاوانا.

٤- پشکداری کرن د پاراستنا تەناهی و ئارامی و بجهئینانا یاسایان و پاراستنا ساخلەمیێ و پاقژیی ب پشکداریکرنێ د هەوێن پاقژکرنا تاخ و جاددە و کولانان‌دا.

٥- هاندانا خەلکی ژبۆ هەروەنەدانا سەرو سامانێ نیشتیمانی نەخاسمە ئاڤ و کەهرەبێ، چونکە بدەستڤە ئینانا وان کارەکێ بساناهی نینە.

٦- رێزگرتنا پیر و پەککەفتی و کێم ئەنداما چونکە ئەو ژی برایێن مەنە و کورێن ڤی مللەتینە، رێزگرتنا وان وەفاداریە بۆ وی رۆلێ کو وان هەبوویە و دێ هەبیت د بەرەف پێشبرن و گەشەکرنا جڤاکێ کوردەواریدا.

٧- پشکداریکرن د هەوێن چاندنا نەماماندا و نەبرینا داروباری و پاراستنا وی چونکە مفایێن جودا جودا هەنە.

٨- پاراستنا ئەڤ دەسکەفتێن جڤاکی وەك گلۆپ و وایرێ کەهرەبێ و تەلەفون و کەل و پەلێن یاریگەهـ و مەلەڤانگەهـ و سەیرانگەهـ و جهێن گشتی و هەمی ئەو تشتێن دی ژی کو ملکێ هەمیانە.

## بزاڤ و چالاکی:

١- مامۆستایێ رێزدار داخازێ ژ قوتابیێن خۆ بکە بابەتەکی د دەفتەرا بزاڤ و چالاکیێن خۆ دا بنڤیسن دەربارەی (قوتابی د پاشەرۆژێدا دێ پشکداریێ د ئاڤاکرنا جڤاکیدا کەت).

٢- قوتابیێ خوشتڤی وێنێ ئوتومبێلەکا ئاگرڤەمراندنێ پەیدا بکە و بێخە دناڤ دەفتەرا بزاڤ و چالاکیێن خۆ دا.

٣- ژ دەزگەهێن حکومەتا هەرێما کوردستانێ ژبۆ نەهێلانا تاوانان وەك:




٤- ژ بۆ بهێزکرنا پەیوەندیان دناڤبەرا خواندنگەهان و دام و دەزگەهێن دەولەتێدا، مامۆستا دشێت داخازێ ژ رێڤەبەرێ قوتابخانێ بکەت کو ئەفسەرەکێ هاتنوچوونێ یان ئەفسەرەکێ بەرەڤانیا مەدەنی سەرەدانا خواندنگەهێ بکەت یان قوتابیان ببەت بۆ سەرەدانا دەزگەهێ ئاگرڤەمراندنێ یان سەرەدانا دەزگەهەکێ باژێرڤانیێ.

# پەیوەندی دناڤبەرا قوتابخانێ و جڤاکی

خواندنگەھ وی دەمی دشێت پێشکەڤیت و ئەرکێ سەر ملێن خۆ گەلەك ب باشی بجھ بینیت کو پەیوەندیەکا موکم و بھێز لگەل وێ جڤاکی ھەبیت یێ خواندنگەھ تێدا و جڤاك ژی دەستێ ھاریکاریێ بۆ خواندنگەھێ درێژکەت و ھاریکاریا وێ بکەت بۆ باشتر برێڤەچوونا پرۆسێسا خواندنا کورێن وان.

گەلەك جڤاك بزاڤێ دکەن کو پەیوەندیەکا موکم دناڤبەرا خواندنگەھێ و دایکان و باباندا ھەبیت ژبۆ پێگەھاندنا قوتابیان ب رەنگەکێ راست و دروست.

ئەرێ باشترین ھۆکار و رێ بۆ بدەستڤەئینانا ھەڤکاریێ دناڤبەرا کەس و کارێن قوتابیان و خواندنگەھێدا چنە؟

**بەرسڤ/** کۆنگرە یان جڤاتا دایك و بابان و مامۆستایانە.

ئەڤ کۆمبوونە بۆ چ مەرەمەکێ دھێتە کرن؟

**بەرسڤ/** بۆ زانینا ڤان خالێن ل خارێ یە:

| ١ | زانینا پلا پێشکەفتنا قوتابیان. |
|---|---|
| ٢ | زانینا حەز و ئارەزوویێن قوتابیان و سنورێن شیانێن وان. |
| ٣ | سەر ھەلبون ل ئاریشە و ئاستەنگێن قوتابیان ل ماڵ و خواندنگەھێ. |

خواندنگەهـ و مال تەواوکەرێن هەڤدونە و خواندنگەهـ دشێت ب ساناهی پەیوەندیێ ب سەمیانێن قوتابیان بکەت و بەروڤاژی ژی سەمیانێن قوتابیان دشێن سەرەدانا خوێندنگەهان بکەن و پرسیارا کورێن خۆ بکەن و ڕێڤەبەر و رابەرێ پۆلێ و مامۆستایێن وان ببینن.

ئەڤ کۆر و کۆمبوونە ل هەر سال لگەل دەسپێکا سالا خاندنێ دەستپێدکەن و هەیڤێ جارەکێ یان ل دویف پێویستیێ دهێنە کرن، سەروکێ جڤاتا دایکان و بابان و مامۆستایان یان دناڤ دەستەکا مامۆستایان یان دناڤ کەس و کارێن قوتابیاندا دهێتە هەلبژارتن، ل دەسپێکا سالێ خەلك دهێنە گازیکرن بۆ خواندنگەهێ بۆ کۆمبوونێ و باسکرنا وێ پلانا کو لبەرە وێ سالێ لسەر بچن.

هەژی گوتنێ یە ژ ئەنجامێ کۆمبوونێن دایکان و بابان و مامۆستایان گەلەك کارێن ب بها و پرۆژێن بمفا بدەستڤە دهێن.

## ئەو كارێن جڤاتا دایكان و بابان و ماموّستایان بجه دئینن:

١ د دەسپێكا سالا خواندنا نوو دا دایك و بابێن قوتابیان ل پروّگرامێ خواندنگەهێ دهێنه ئاگەهداركرن هەتا وێنەكێ روون و ئاشكرا یێ خواندنگەهێ ل بەرچاڤێن وان بیت.

٢ ل داهێنانا بزاڤ و چالاكیێن نوو بوّ خواندنگەهێ مفا ژ شیانێت بابان و دەیكان دهێنه وەرگرتن.

٣ هەڤكاركرن بوّ دەستنیشانكرنا ئاریشێن قوتابیان و دانانا رێ وچارێن گونجای ژ بوّ چارەسەركرنا ئاریشێن وان.

٤ دابینكرنا هندەك پێدڤیێن خواندنگەهان بێ كو د بوجێدا پارە بوّ هاتبیتە تەرخانكرن وەك چێكرنا كورسیێن شكەستی و بوّیاغكرن و تەواوكرنا كێم و كاسیان و پێدڤیێن جوّراوجوّر. دایك و باب ب گوهداریكرنا گوّتارێن خواندنگەهێ و سمینارا

٥ رەوشەنبیریەكا گشتی بدەست خوّڤە دئینن و ئاگەهداری پەروەردەكرنا كورێن خوّ دبن.

هاریكاریكرن بوّ پاراستنا زاروّكان ژ دیاردێن دزیێ و

٦ دیاركرنا كێم و كاسیان و گوهداربوون لسەر رەوشتێ زاروّكان و چاڤدێریكرنا ساخلەمیا وان و پشتراستبوون ژ لەشساخیا وان.

# یاسا و ریسایێن خواندنگەهێ

پێکهاتیە ژ کومەکا یاسا و ریسا و رێنمایی و پرۆسێسا پەروەردەیی ب مەرەما رێکخستن و بەرەف پێشڤەبرنا کاروبارێن خاندنێ، کو ژ لایێ لایەنێن پەروەردەیی یێن پەیوەندیدار ڤە دهێنە دەرئێخستن و پێدڤیە لسەر هەمی ئەندامێن خێزانا قوتابی پەیرەوبکەن و گەلەك ب هووری بجه بینن.

ئەو رێنمایی دشێن بهێنە گوهۆرین لپەی پێشکەفتنا زانستی و لپەی فەلسەفا پەروەردەیی یا وەلاتی کو ژ کووراتیا بارودۆخێ جڤاکێ قوتابیان دەرکەفتیە و ب گشتی د خزمەتا واندایە دا کو ب ئاوایەکێ مودێرن بهێتە پەروەردەکرن.

هەروەسا ئەو رێنمایی د چارچووڤێ چەند یاسا و ریسایێن رێکوپێك هاتینە دارێتن و پەیوەندیدارن ب بیاڤێن:

| باوەرنامە | تۆمارێن جۆراوجۆرێن خواندنگەهێ | دەوامێ |
|---|---|---|

ئەزموونان

رێکێین رێکخستنا رەفتارێن ئەندامێن خێزانا خواندنگەهێ

ئەرك و كارێن د خواندنگەهێدا ل گورەی یاسا و رێسایان هاتینە دابەشكرن لسەر:

| قوتابیان | خزمەتگوزاران | مامۆستایان | رێڤەبەر |
|---|---|---|---|

بۆ هندێ كو هەر ئێك ژ ڤان ئەنداما ئەرك و مافێن خۆ بزانیت و ئەگەر پێگیریێ ب وان رێنمایان نەكەت و پشت گوهێ خۆ بێخیت ئەڤجا دێ تووشی لێپرسینێ بەرپرسیاربیت.

بۆ هندێ كو ئەڤ رێنمایە بەلاڤ نەبن و دەزگەهێن پەروەردەیی یێن بەرپرسیار هاتینە و هەمی كومكرینە و د چەند پەرتووك و نامیلكاندا چاپكرینە و بسەر خوێندنگەهاندا بەلاڤكرینە.